زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز(35)

# چەپکە گوڵێك
# لە باخچەکانی ئامۆژگاری
# بۆ خوشکان


ئامادەکردنی

مامۆستا عەدنان بارام

مامۆستا فەرەیدون موحەممەد

دایکی سوننە

ناوی پەرتووك:

**چەپکە گوڵێک لە باخچەکانی ئامۆژگاری**

**بۆ خوشکان**

ناوی ئامادەکاران:

**مامۆستا عەدنان بارام**

**مامۆستا فەرەیدون موحەمەد**

**دایکی سوننە**



**چاپی سێیەم**

**1431 کۆچی**

**زنجیرەی پەروەردەو بانگەواز**

(35)

**ژمارەی سپاردن**

(879)

**کتێبخانەی سیما**

(07701236089)

بنکەی بڵاوکردنەوە:

**کتێبخانەی سوننە**

**(سلێمانی)**

**کتێبخانەی سیما**

**(چەمچەماڵ)**

**کتێبخانەی زانست**

**(کەلار)**

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ [ آل عمران : 102 ] .

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ [ النساء : 1 ] .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ [ الأحزاب : 70 ـــ 71 ] .

أَمَّا بَعْدُ : فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

## چەپکە گوڵێك لە باخچەكانی ئامۆژگاری بۆ خوشكان

**أما بعد :** بۆ هەموو مواریە خۆپارێزەكان، بۆ هەموو گەوهەرەیەكی بەنرخ، بۆ ئەو ئافرەتانەی كە بڕیاریان داوە پۆشاكی شەرم و حەیا لەبەر بكەن ، چونكە فەرمانی پەروەردگاریانە ، ئەوەش تەنها لە بەر ڕەزامەندی ئەو ، بۆ ئەوەی بە بەهەشتی بەرین شاد بن .

**بۆ تۆ خوشكی موسڵمانم:** كە پێشەوات خێزانە بەڕێزەكانی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، بۆ تۆ كە پاپەندی ئایەتە پیرۆزەكانی قورئانیو فەرموودەكانی پێغەمبەری خوایتﷺ ، نەك پابەندی مۆدەو سەرگەردانبووی شوێنی ئەم و ئەو .

**بۆ ئەو خوشكانەم :** كە نایانەوێ هەڵخەڵەتاوی ئەو كەسانە بن كە بەناو مافەكانیانەوە ئەیانەوێ پۆشاكی حیشمەتیان لە بەر داكەنن ، ئەوەش نەك لە بەر ئافرەتان بەڵكو لە بەر تێركردنی ئارەزووە گڵاوەكانیان ، بۆ ئەوەی لە كۆتایدا تۆی بەرێز وەكو گوڵێكی گەڵا هەڵوەریو بە جێ بهێڵن ! ! دوای ئەوەی وەكو بوكە شووشەی دەستی منداڵان یاری خۆیانت پێدەكەن ! ! !

**گەوهەرە بەنرخەكەم :** ئەمە گوڵێكە لە باخچەی برایەتی بۆتم هەڵمبژاردووە ، بۆنی برایەتی و دڵسۆزی لێ دێت ، بە شێوازی ئامۆژگاری دامڕشتووە ، هاندەری نووسینی ویستنی خێرو خۆشبەختیە بۆ تۆی گەوهەری بەنرخ و خۆ پارێزم ، بەڵكو جێگەی بایەخپێدانی تۆی بەڕێز بێت ، پەروەردگار پارێزەرت بێت .

## چه پکه گوڵێك له باخچه‌كانی ئامۆژگاری بۆ خوشكان

**خوشكه‌كه‌م :** لای به‌ڕێزتان شاره‌وه نیه هه‌موو ئه‌و هه‌وڵانه‌ی كه كه‌سانی ئاره‌زوو په‌رست به‌رنامه ڕێژی بۆ ده‌كه‌ن و پیاده‌ی ده‌كه‌ن بۆ له‌خشته بردنی ئافره‌تی موسوڵمان ، وله‌ده‌ستدانی حیشمه‌تی ، بۆیه ده‌بینین هه‌موو ساتێك هاتوهاوارێكه‌و هه‌موو ڕۆژێكیش موده‌یه‌كی نوێیه ! ! دبینرێت و ده‌بیسترێت له‌باسی بالاپۆشی تۆی بڕوادار له شێوه‌و شێوازی دورینیدا ، ئه‌مه‌یان ته‌نك وناسك ! ! ئه‌ویتریان ته‌سك یان كورت ! ! یه‌كێكی تریش ڕازاوه‌و ته‌تریزكراو ! ! هه‌موو ئه‌وه‌ش بۆ ڕووشاندنی پاكێتی تۆیه ڕۆژ له‌دوای ڕۆژ خوشكانمان به‌وه بزانن یان نه ... سكالای ئه‌و كاره‌ش بۆ لای په‌روه‌ردگار به‌رز ده‌كه‌ینه‌وه .

**گه‌وهه‌ره‌ی خۆپارێزم :** كار له‌م سنووره‌ش نه‌وه‌ستاوه به‌ڵكو گه‌شتۆته ئه‌وه‌ی كه بگاته حجاب و بالاپۆشه‌كه‌تان ده‌بینین ده‌ستی خیانه‌تكارانی گه‌شتۆتیێ ! ! ! ئه‌مه‌یان عابای فه‌ره‌نسیه ! ! ! ئه‌ویتریان عابای سه‌رشانیه ! ! ! ئه‌وه‌شیان له ناوقه‌ده‌وه ته‌سككراوه‌ته‌وه به گوێره‌ی ناوقه‌دی خوشكی بالاپۆشم ! ! ! یه‌كیكی تر ڕه‌نگاوڕه‌نگ و نه‌خشین و ته‌تریزكراوه ! ! ! به‌شێوه‌یه‌ك پۆشینی عابا بۆته باشترین زه‌مینه بۆ پیاده‌كردنی موده ! ! و ده‌رخستنی جوانیه‌كان ! ! جا نازانم كه‌ی خوشكانی بالاپۆشم هه‌ست به ترسناكی ئه‌و كاره‌یان ده‌كه‌ن ؟ ! یان به‌وه‌ی ئه‌و پیلانانه هه‌موو بۆ له خشته‌بردن و له‌كه‌داركردنی حه‌یا و شه‌رم و شكۆی ئه‌وانه ؟ ! !

**خوشکی خۆپارێزم :** کە من دەبینم تۆ کەوتوویتەتە تۆڕی ئارەزووپەرستانەوە ، ڕازی نەبووم لەوەی کە تۆ زیاتر بۆ هەڵدێر ببرێیت بۆیە بێدەنگ نەبووم ، بەڵام ئایا تۆ هەستت بەوە کردووە کە تۆی بەڕێز کە باڵاپۆشەکەت پۆشیوە لە پەرستشێکی بۆ پەروەردگارت و بەهۆیەوە لێوە نزیك دەبیتەوە ؟! چونکە کردەوەکەت وەڵامدانەوەی فەرمانی پەروەردگارتە ، بەڵکو دەبێت ئەوەشت لا ئاشکرا بێت کە هەر نارەحەتیەکت تووشبێت بەهۆیەوە لە بەرامبەری پاداشت دەدرێتەوە ، جا خۆشبەختی بۆ ئەو خوشکانەی کە بەو شێوە دیدەو چاوڕۆشنن و باڵاپۆشی حیشمەت و حەیایان پۆشیوە و بەو شێوەیەشە کە پەروەردگاریان فەرمانی پێکردوون ، نەك بەپێی مودە و ئارەزووی ئارەزووپەرستان و چەواشەکاران .

**خوشکی گرانبەهام :** دەبێت تۆ بزانیت باڵاپۆشەکەت ئەوەیە کە دەتپارێزێت لە چاوی نامەحرەم و جوانیەکانت دەرناخات ، بۆ ئەوەی وەکو مرواریەکی پارێزراو بیت لە ناو پاڵاپۆشەکەتدا ، وە پاڵاپۆشەکەشتە هۆکاری بەرزی و بڵندیت لە دونیا و دوارۆژدا ، ئەوەش بۆ ئەوەیە بەوەوە جیابکرێتەوە لە هەموو ئافرەتانی تر ، وە تەنها باڵاپۆشەکەشتە لە چاوی گورگە برسیەکانی مرۆڤ دەتپارێزێت ، کە هەموو کۆششێکیان ڕووشاندنی شەرم و شکۆی شکۆدارانە ، بۆیە گەوهەرەی بەنرخ و مرواری خۆپارێز هەوڵی ئەوە بدە ئەم چەپکە

## چەپکە گوڵێك لە باخچەکانی ئامۆژگاری بۆ خوشکان

گوڵەمان لێ وەرگرە کە لە باخچەکانی ئامۆژگاری بۆ تۆی بەڕێزمان ئامادەکردووە بۆ ئەوەی بالاپۆشەکەت وەکو هەموو پەرستشەکانی ترت تێروتەسەل و بێ کەم و کوڕی بێت .

**لە کۆتایشدا پێت دەڵێم :** خوشکەکەم بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت و نەکەی ببیت بە قوربانی شەیتان ، و بتکات بە فاکتەری لە خشتەبردنی کەسانی تر ، مردن ئازارەکانی گیان کێشان بخە پێش چاوی خۆت ، و تاریکی گۆڕ هەرگیز لەیاد نەکەی ، لەو ساتانەی جگە لە کردەوەکانی خۆت نەبێت هیچ هاوەڵ و هاودەمیەکت نیە ، وە بەردەوام یادی دواڕۆژ بکەوە کە چەند سەخت و دژوارە ، بیر لەوەش بکەوە کە ڕۆژێك دەبێت بە سەر پردی سیراتدا بڕۆیت ، ڕۆژێکیش دێت کە نامەی کردەوەکان بڵاودەکرێتەوە کەسێك بەدەستی چەپ و ئەویتریش بە دەستی ڕاست ... لەو کاتانەدا پەشیمانی دادت ناخوات ، گریانیش هیچ سودێکی نیە کۆمەڵانێك بۆ دۆزەخ دەڕۆن و کۆمەڵانێکیش بۆ بەهەشتی بەرین خوای پەروەردگار پارێزەرت بێت لە هەموو خراپە و دژواریەکی دنیا و دواڕۆژ .

وَآخِرُ دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

**مامۆستا عدنان بارام کەلاری**

10/ = / 1429 ك

خوشکی بەڕێزم

# ئایا دەزانی
# ئاکامی باڵانەپۆشینت چ یە ؟

ئامادەکردنی
مامۆستا عدنان بارام

بسم الله الرحمن الرحيم

## چه پکه گوڵێك له باخچه‌كانی ئامۆژگاری بۆ خوشكان

**خوشكی به‌ڕێزم :** داواكارم ئه‌گه‌ر بتوانی به گوێ دڵ گوێبیستی ووته‌كانم بیت ، و هه‌ست و بیری خۆتم بده‌یتێ ، له چه‌ند خوله‌كێكی ژیانت ، بۆ ئه‌وه‌ی چه‌ند ئامۆژگاریه‌كت به گوێدا بده‌م ، كه هه‌موویان ئامۆژگاری دڵسۆزن بۆ كه‌سێكی خۆشه‌ویستی خۆی ، له لایه‌ن كه‌سێكی په‌رۆش له سه‌ر دوا ڕۆژ و ژیانت ، له ڕۆژگارێكدا كه ئامۆژگاریكاران تێدا كه‌م و به‌ده‌گمه‌نن ، ئامۆژگاریه‌كانیشم به شێوه‌ی پرسیار ده‌بن ، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌موو پرسیارێكی زه‌نگێكی بیداركاری بێت ، و چیتر له خه‌وی غه‌فڵه‌ت بێدارت بكاته‌وه ، و به ئاگا بیت ، و قوڵی خواناسانه‌ی بۆ هه‌ڵماڵیت و په‌شیمان ببیته‌وه له‌وه‌ی كه ڕۆژێك له ڕۆژان كه‌مته‌رخه‌میه‌كت نوواندبێت له بالا پۆشیتدا ، كه نیشانی بڕواداری حیشمه‌ت و جوانی تۆیه له دونیای كۆتای هاتوو ، هۆكاری ڕزگار بوونی هه‌تا هه‌تاییته له ئاگری دۆزه‌خ ، ئه‌و دۆزه‌خه‌ی كه خوای په‌روه‌ردگار له وه‌سفیدا فه‌رموویه‌تی : ﴿ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾ ( سورة البقرة : 24 ) ، واته : له‌و ئاگره بترسن كه سووته‌مه‌نیه‌كه‌ی خه‌ڵك و به‌رده ، خوای په‌روه‌ردگار په‌نای من و تۆش بدات له‌وه‌ی كه خۆمان به ده‌ستی خۆمان بۆ دونیا و خۆشیه‌كی كاتی بكه‌ین به سووته‌مه‌نی ئه‌و ئاگره ، بۆیه داواكارم ئه‌گه‌ر تا ئه‌م ڕۆش كه‌مته‌رخه‌میه‌كت له بالاپۆشه‌كه‌تدا كردبێت ،

## چەپکە گوڵێك لە باخچەکانی ئامۆژگاری بۆ خوشکان

دووای بیستنی ئەم ووتانە بڕیاری یەك لای خۆت بدەیت و بالآپۆشیەکەت بە باشترین شێوە و بەو مەرجانەی کە پێویستە لە بالآ پۆشەکەتدا هەبێت ئەنجام بدەیت ، و سەردەمی سستی و تەمبەڵی بەلاوە بنەیت ، بزانی کە مانەوەت لە دونیادا کاتی و کەمە ، بەڵکو هەر زۆر کەمە ، و سەردەمی لاوێتی دەڕوات و نامێنێت ، و جوانیەکەشت بەهەمان شێوە لە ناو دەچێت و نامێنێت ، و گەشی و درەوشاوەیی لە ناو دەچێت ، ئەوەش : بە مردنێکی نزیك و خێرا ، یان بە پیریەك کە لە ڕێگەی هەمووانە و دێت ، و بە هیچ شێوەیەك دەرچوون نیە لە دەستی ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی :﴿ وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴾ ( سورة البقرة : 281 ) ، واتە : خۆتان بپارێزن لەو ڕۆژەی کە دەگەڕێنەوە تیایدا بۆ لای خوای پەورەدگار ، پاشان هەموو کەسێك پاداشت دەدرێتەوە لەو کردارانەی کە ئەنجامی داون ، و دڵنیاش بن کە کەس لەو ڕۆژەدا ستەمی لێ ناکرێت .

## ئەمەش ئامۆژگاریەکانن :

✍ وە ئایا دەزانی بالآنەپۆشینت سەرپێچی کردن و شکاندنی فەرمان و ووتەی پەروەردگارتە کە فرمانی پێکردوویت : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ... ﴾ ( سورة الأحزاب : 59 ) ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزان و کچەکانت و ئافرەتی بڕواداران بڵێ با بالآ پۆشەکانیان بدەن بە خۆیاندا .

وە هەروەکو فەرموویەتی :﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾ ( سورة الأحزاب : 33 ) ، واتە : لەکاتی دەرچونتاندا خۆتان ڕووت نەکەنەوە ، هەروەك چۆن ئافرەتان لە سەردەمی نەفامیدا خۆیان ڕووت دەکردەوە .

✍ وە ئایا دەزانیت ئەو کارەت هۆکاری ئازاردنی خۆتە ، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (سورة الأحزاب :59 ) ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزان و کچەکانت و ئافرەتی بڕواداران بڵێ با بالآ پۆشەکانیان بدەن بە خۆیاندا ، ئەوەش نزیك ترە بۆ ئەوەی کە بە ڕەوشت بەرز و بە حەیا و حیشمت بناسرێنەوە ، و ئەزیەت و ئازار نەدرێن ، پەروەردگاری تۆش لێبووردە و میهرەبانە .

✍ وه‌ ئایا ده‌زانیت به‌و كاره‌ت چاوی گورگه‌ برسیه‌كان ، و كه‌سانی دڵ نه‌خۆش تێر ده‌كه‌یت ، و ده‌بیته‌ی هۆی ئه‌وه‌ی سه‌ده‌ان له‌و گورگانه‌ تـه‌ماحت تـێ بكه‌ن ؟! هه‌روه‌كو خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ﴾ ( سورة الأحزاب : 32 ) ، واتـه‌ : پێویسته‌ له‌ سه‌رتان له‌ هه‌موو ڕێگه‌یه‌كی حه‌رام و قه‌ده‌غه‌كرا و خۆتان بپارێزن ، له‌وانه‌ش قسه‌ نه‌كردنه‌ به‌ نازه‌وه‌ له‌ گه‌ڵ پیاوانی نامه‌حره‌مدا ، بۆ ئه‌وه‌ی كه‌سانی ده‌روون نه‌خۆش ته‌ماحتان تێنه‌كه‌ن ، ووته‌شتان با ووته‌یه‌كی ئاسایی بێت ، ئه‌مه‌ ئه‌گه‌ر ووته‌كانت ئه‌وه‌نده‌ كاریگه‌ر بن ، ئه‌ی ئه‌بێت باڵا نه‌پۆشینت چۆن بێت ؟!! جا ئامان نه‌كه‌ی خوشكه‌كه‌م خۆت بكه‌یته‌ جێی ته‌ماحی گورگه‌ برسیه‌كانی ئه‌م ڕۆژگاره‌ .

✍ وه‌ ئایا ده‌زانیت كه‌ باڵا نه‌پۆشینت پێچه‌وانه‌ بوونه‌وه‌ی ووته‌ی پێغه‌مبه‌ره‌ی خوایه‌ ﷺ ، و ڕازیكردن و شوێنكه‌وته‌ی ووته‌ی شه‌یتانه‌كانی جنۆكه‌ و مرۆڤه‌ ؟! پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رموویه‌تی : " يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيض لم يصلح أن يرى منها شيء إلا هذا وهذا – وأشار إلى وجهه وكفيه "[1] .

---

[1] حسنه الألباني في صحيح الجامع ، برقم : (7874).

واتە : ئەی ئەسما ئەگەر ئافرەتی موسڵمان گەشتە تەمەنی باڵغ بوون نابێت جگە لە دەستەکان و ڕوومەتی زیاتر دەرکەوێت .

وە خوای پەروەردگار بۆمان دەگێڕێتەوە کە شەیتان لە گەڵ باوکە ئادەم و دایکە حەوادا چی کردووە ، کە فەرموویەتی : ﴿ ... فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا ... ﴾ ( سورة طــه : 121 ) ، واتە : بە هۆی ئەو تاوانەی کە پێی کردن ، عەورەتیان دەرکەوت .

✍ وە ئایا دەزانیت بەو کارەت خۆت بە ئەهلی دۆزەخ دادەنەیت ، و خۆت دەخەیتە ڕیزی دۆزەخیانەوە ، خوای پەروەردگار پارێزەرت بێت لە ئاگری دۆزەخ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا ... وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ ... "[2].

واتە : دوو کۆمەڵ هەن لە ئەهلی دۆزەخ نەمبینیوون ... کۆمەڵێکیان ئافرەتێلێکن داپۆشراون بەناو لە ڕاستیدا ڕووتن ، بەلەنجەولار دەڕۆنە ڕێوە ، و سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان ڕادەکێشن ، و پرچیان بە شێوەیەك بە سەر سەریانەوە دەبەستن وەکو بان پشتی ووشتر وایە ... وە زانایان فەرمویانە: (( أراد ﷺ النساء اللواتي

[2] رواه مسلم .

يلبسن من الثياب الشيء الخفيف ، الذي يصف ولا يستر ، فهنَّ كاسيات بالإسم ، عاريات في الحقيقة )) [1].

واتە : مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتانەیە کە جل و بەرگی ناسك دەکەنە بەر ئەو جۆرە پۆشاکانە لە ڕاستیدا لەشیان دەردەخات ، نەك ئەوەی کە دایان بپۆشێت ، ئەو جۆرە ئافرەتانە بە ناو داپۆشراون ، کەچی لە ڕاستیدا ڕووتن .

✍ وە ئایا دەزانیت بە ئەو کارەت وا لە خۆت دەکەی کە بەر نەفرەتی موسڵمانان بکەویت ـ خوای پەروەردگار پەنات دات ـ نەفرەتیش ، واتە : دووری و دەرچوونت لە ڕەحمەتی خوای بەزەیی ، هەروەکو پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : " ... ، نساؤهم كاسيات عاريات على رؤوسهن كأسنمة البخت العجاف العنوهن فإنهن ملعونات ... " [2].

واتە : ئافرەتەکانیان داپۆشراون بەناو لە ڕاستیدا ڕووتن ، بەسەر سەریانەوە وەکو پشتی ووشتر هەیە ـ واتە : پرچیان بە شێوەیەك بە

---

(1) جلباب المرأة المسلمة : 127.

(2) صححه العلامة الألباني في السلسلة الصحيحة ، برقم : 2683 ، وفي صحيح الترغيب والترهيب ، برقم : 2044 ).

سەر سەریانەوە دەبەستن ـ نەفرەتیان لێ بكەن ئەوانە نەفرەت لێكراوون .

✍ وە ئایا دەزانیت بەباڵا نەپۆشینت خۆتی پێ بێ بەش دەكەی له بەهەشتی بەرینی خوای پەروەردگار ، هەروەكو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بەوە داوە و فەرموویەتی : " صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا ... وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا "[1]. واتە : دوو كۆمەڵ هەن له ئەهلی دۆزەخ نەمبینیوون ... كۆمەڵێكیان ئافرەتێلێكن داپۆشراون بەناو له ڕاستیدا ڕووتن ، بەلەنجەولار دەڕۆنە ڕێوە ، و سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان ڕادەكێشن ، و پرچیان بە شێوەیەك بە سەر سەریانەوە دەبەستن وەكو بان پشتی ووشتر وایە ، ئەوانە ناڕۆنە بەهەشتەوە ئەگەر چی بۆنی بەهەشت له دووری ئەوەندە و ئەوەندەشەوە دەبیسترێت .

✍ وە ئایا دەزانیت بەو كردارەت تاوانی ئەو كەسانەش دەخەیتە ئەستۆە خۆت كە تۆ له خشتەیان دەبیت ، و دەیانخەیتە تاوانەوە ، خوای پەروەردگار فەرمویەتی : ﴿لِيَحْمِلُواْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً

---

[1] رواه مسلم .

يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلاَ سَاء مَا يَزِرُونَ ﴾

( سورة النحل : 25 ) .

واتە : لە ڕۆژی دواییدا تاوانباران تاوانی خۆیان بە تەواوی هەڵدەگرن ، لە گەڵ تاوانی ئەوانەی کە گومڕایان دەکەن بە بێ زانین ، بەڕاستی ئەوە تاوانبارییەکی زرۆ خراپە .

✍ وە ئایا دەزانیت بەو کارەت خۆت دەخەیتە ڕیزی دوو ڕووانەوە ـ خوای پەروەردگار پەنادەرت بێت لەو کارە ـ هەروەکو لە فەرمووددا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " وشر نسائكم المتبرجات المتخيلات ، وهن المنافقات ، لا يدخل الجنة منهن إلا مثل الغراب الأعصم " [1] ، واتە : خرابترینی ئافرەتەکانتان ئەو ئافرەتانەن کە جوانیەکانی خۆیان دەردەخەن ، و خۆ دەڕازێننەوە ، و لە خۆ ڕازین و فیز و تەکەبور دەکەن بە سەر ئافرەتانی تردا ، بەڕاستی ئەوانە خۆ دەشوبهێنن بە دوو ڕووان ، هیچ یەکێك لەوانە ناڕواتە بەهەشتەوە ، ئیللا وەکو قەڵە بازەڵە نەبێت ( کە جۆرێکە لە قەڵە ڕەش باڵەکانی یان پێکانی سپین ) ، هێنانەوەی ئەم شێوەیە لە قەڵە ڕەش بە نموونە بە هۆی کەمیانەوەیە ، بۆ ئاماژە کردنە بە کەمی ئەو ئافرەتانەی کە دەڕۆنە بەهەشتەوە ، ئەگەر باڵا پۆش نەبن .

---

[1] صححه العلامة الألباني في : الصحيحة ، برقم :( 1849 ).

لە کۆتایدا پێت دەڵێم ئەگەر تاکو ئەم ڕۆ نەتزانیبێت ، ئەوا ئەم ڕۆ ئەو تاوانەت لا ئاشکرا بوو ، بەڵام نائومیدیش مەبە لە ڕەحمەتی خوای میهرەمان ئەگەر تۆبەیەکی ڕاستەقینەت کرد و گەڕایتەوە بۆ لای ئەو ، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ ( سورة الزمر : 53 ) ، واتە : بڵێ بەو بەندانەی کە زیادڕەویان کردووە لە تاوان کردندا ، بێ ئومێد و مەئیووس نەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوای پەروەردگار ، چونکە خوای پەروەردگار لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێت ، هەر ئەویشە لێبوردە ، و بە بەزەییە بەرامبەر بە بەندەکانی .

**جا خوشکی بەڕێزم :** بیرێك لەم ووتانە بکەرەوە ، وبڕیار بدە کە ئایا دوای بیستنی ئەم ووتانە هێشتا هەر بەردەوام دەبیت لە سەر باڵا نەپۆشینت ، وهێشتا دڵت ڕانەچەڵەکیوە ؟! یان چی ؟!

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

خوشکی بەڕێزم

# ئەمەیە مەرجەکانی

# باڵاپۆشەکەت

وەرگێڕانی

دایکی سوننە

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ [1] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خواﷺ بە خێزان و كچەكانت و ئافرەتی بڕواداران بڵێ با جلبابەكانیان ( جلبابیش : واتە : عابا) بدەن بە خۆیاندا، ئەوەش نزیك ترە بۆ ئەوەی كە بە ڕەوشت بەرزو بە حەیاو حیشمەتو قورس و سەنگینی بناسرێنەوە، تا ئەزیەتو ئازار نەدرێ ، پەروەردگاری تۆش لێبووردە و میهرەبانە .

**خوشكەكەم :** بزانە كە خوای بڵند و باڵا دەست پلە و پایەیەكی بەرزی بۆ ئافرەتان داناوە، هەر بۆ ئەوەشە كە فرمان پێكردنی بە پۆشاكی شەرعی وە خۆداپۆشین و ڕێز لێنانە، و پلە بەرزی یە بۆ ئافرەتان، وە پارێزەریشە بۆی بۆ ئەوەی نەبێت بە كاڵایەكی بێ نرخ هەریەكە بە وویستی خۆی هەرچۆنێك و هەر كاتێك بیەوێت تەماشای بكات، وە بۆ ئەوەی ئەم پۆشاكە بێتە هۆكارێك بۆ دەست درێژی نەكردنە سەری، ڕێگر بێت لە هاندانی گەنجان بۆ خۆی .

---

[1] ( سورة الأحزاب : 59 )

جا بۆ ئەوەی ئەو پۆشاکە پۆشاکێکی شەرعی بێت، هەروەکو چۆن خوای گەورە، و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێکردووە، دەبێت چەند مەرجێکی شەرعی پێویستی تێدا بێت، لەوانە :

1. **دا پۆشەری هەموو لەش بێت ، دەست و ڕوومەت نەبێت**[1] **:** هەر چەند داپۆشینی ئەو دووانەش باشتر و تەواوتر و چاکترە، لە بەر هەموو ئەو بەڵگانەی کە لەو بارەیەوە هاتوون، و ئەو داپۆشینەشە کە کاری ئافرەتانی پێشینی لە سەر بووە (خوایان لێ ڕازی بێت)، وە لە سەروی ئەوانیشەوە خێزانە پاكو بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، (خوایان لێ ڕازی بێت) .

2. **نابێت پۆشاکەکە بۆ ناوبانگ ، و شۆرەت بێت :** واتە نابێت مەبەستی لە داپۆشینەکەی ئەوەبێت کە سەرنج و دیدی خەڵك بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، ئەویش خۆی لێ بایی بێت و موعجیب بێت بەخۆیو

---

[1] بەلآم سەبارەت بە پێکانی ئافرەت بەهەمان شێوە بە عەورەت دەژمێردرێن ، و پێویستە داپۆشرێن ، داپۆشینیشیان بە گۆرەوەی بەس نیە ، با گورەویەکانیش ئەستور بن ، چونکە قەبارەی پێکان دەردەخەن ، بۆیە دەبینین کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا سەبارەت بە دامێنە ، و پالدمی ئافرەتان ؟ فەرمووی : " یرخین شبراً " ،واتە : با بستێك شۆڕی بکەنەوە ، ( أم سلمة ) ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ فەرمووی : کەواتە پێکانیان دەر دەکەوێت ؟! ئەویش فەرمووی :( فیرخینه ذراعاً ، لا یزدن علیه )، واتە : با باڵێك درێژی بکەنەوە ، و لەوەش زیاتری نەکەنەوە ( سلسلة الأحادیث الصحیحة : 1864 ) .

بەسەریاندا فیز زلی لێبدات، و فیزیان بە سەردا بکات، با پۆشاکەکەشی پینەکراویش بێت، مادامە مەبەستی پیَی ناوبانگ و ناودەرکردن بێت لە ناو خەڵکدا، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی : " مَن لَبِسَ ثَوبَ شُهْرَةٍ في الدنيا ، ألبَسَهُ اللهُ ثوبَ مذلَّةٍ يوم القيامة ، ثم أُلهبَ فِيه ناراً " [1] .

واتە : هەرکەسێك لە دونیادا پۆشاکی شۆرەت و ناوبانگی بپۆشێت، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا پۆشاکی سەر شۆڕی و زەلیلی دەکاتە بەری ، پاشان گڕو بڵێسەی تیَ بەر دەدرێت .

**3. ئەبێت ئەستوور بێت و ناسك نەبێت ، بە شێوەیەك ڕەنگی پێست دەرنەخات :** ئەوەش لە بەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ : " سيكونُ في آخرِ أمتي نساءٌ كاسياتٌ عارياتٌ ، على رؤوسهنَّ كأسنمَةِ البُخت ، العنوهنَّ فإنهنَّ ملعونات "[2].

واتە : کۆمەڵە ئافرەتێك ـ لە کۆتایی ئوممەتەکەم ـ دەردەکەون داپۆشراو ، و ڕووتن ، پرچیان بە شێوەیەك بە سەر سەریانەوە

---

[1] حسنه العلامة الألباني في : ( صحيح سنن ابن ماجه : 2 / 1192، برقم : 3607 ) ، و ( صحيح الترغيب والترهيب : 2 ، برقم : 2089 ) ،وە بڕوانە :(جلباب المرأة المسلمة : 213 ) .

[2] صححه العلامة الألباني في : ( السلسلة الصحيحة 6 : 411 ، برقم : 2683 ) ، وە بڕوانە : ( جلباب المرأة المسلمة : 125 ).

دەبەستن وەکو بان پشتی ووشتر وایە، نەفرەتیان لێ بکەن ئەوانە نەفرەت لێکراون .

قال العلماء : (( أرادﷺ النساء اللواتي يلبسن من الثياب الشيء الخفيف ، الذي يصف ولا يستر ، فهنَّ كاسيات بالإسم ، عاريات في الحقيقة ))[1] .

واتە : زانایان فەرمویانە : مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتانەیە کە جلو بەرگی ناسك دەکەنە بەر ئەو جۆرە پۆشاکانە لە ڕاستیدا لەشیان دەردەخات، نەك ئەوەی کە دایان بپۆشێت، ئەو جۆرە ئافرەتانە بە ناو داپۆشراون، کەچی لە ڕاستیدا ڕووتن .

وە کاتێك کە (**منذر**) ی کوڕی (**زبير**) لە عێراق گەڕایەوە جل و بەرگێکی ( **مرويَّة**[2] ، **و قوهية**[3] ) ، نارد بۆ (**أسماء**) ی کچی (**أبو بكر**) ، کە پۆشاکێکی ناسك بوو، ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە(**أسماء**) چاوەکانی لە دەست دابوو ، واتە : نابینا بوو: ڕاوی دەڵێت : کە (**أسماء**) دەستی دا بە پۆشاکەکەوە، فەرمووی : ئۆف بۆ ئەم جل و بەرگە، جلو بەرگەکەی بۆ بگەڕێننەوە، (**منذر**) یش ئەوەی زۆر لەلا

---

[1] ( جلباب المرأة المسلمة :127 ) .

[2] **مَرويّة** : پۆشاکێکی ناودارە لە (العراق) نیسبەتە بۆ (مرو) ، کە لادێیەکە سەر بە (کوفة) یە.

[3] **قَوهيَّة** : پۆشاکێکە لە (قوهستان) دا دروووست دەکرێت ، کە ناوچەیەکە لە(خُراسان)

گەورەو گران بوو، بۆیە فەرمووی: ئەی دایکی بەڕێزم ئەوە تەنكرییە بۆ ئەوەی لەش دەربخات، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر لەشی تێدا دەرنەکەوێت، خۆ قەبارەی لەش دەردەخات [1].

4. **دەبێت فراوان بێت و تەنگ نەبێت** : واتە: **بە شێوەیەك بێت قەبارەی ئەندامەکان دەرنەخات** : لە ( **أسامة** ) ی کوڕی ( **زيد** )ەوە ـ خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت ـ دەفەرمووێت : پێغەمبەری خوا ﷺ جلێکی ( **قبطي** [2] ) پێ بەخشیم کە ئەویش ( **دحية الكلبي** ) پێی بەخشی بوو، منیش دام بە خێزانەکەم بۆ ئەوەی بیپۆشێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: " **مالك لم تلبس القبطية ؟** " ، واتە: ئەوە بۆ جلە ( **قبطية** ) کە لە بەر ناکەیت ؟ منیش پێم ووت : داومە بە خێزانەکەم لە بەری بکات، ئەویش فەرمووی : " **مُرها فلتجعل تحتها غلالة** [3] ، **فإني أخاف أن تصف حجم عظامها** [4] ، واتە

[1] صححه العلامة الألباني في : ( جلباب المرأة المسلمة : 107 ) .

[2] **القبطية** : جۆرە پۆشاك و جلێکی میسری ، تەنك و سپی یە .

[3] **غلالة** : پۆشاکێکە لە ژێرەوەی پۆشاکەکانی تردا دەپۆشرێت ، بۆ ئەوەی قەبارەی لەشی ئافرەت دەرنەکەوێت .

[4] حسنه العلامة الألباني في : ( جلباب المرأة المسلمة : 131 ) ، وقال : الحديث إسناده حسن ، وهو من روياة أسامة بن زيد ، وأخرجه أحمد والبيهقي .

: كە ڕۆشتیتەوە فرمانی پێ بكە بەوەی كە شتێكی تری بە ژێردا بپۆشێت، چونكە لەوە دەترسم قەبارەی ئەندامەكانی لەشی دەربخات .

5. **نابێ بخوركراو و بۆن خۆش كراو بێت :** ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا فەرموویەتی :" أيما امرأة استعطرت ، فمرت على قوم ، ليجدوا من ريحها ، فهي زانية "[1] .

واتە : هەر ئافرەتێك خۆی بۆنخۆش كرد، و ە پاشان لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە، وە بە لای كۆمەڵێكدا تێپەڕ بوو و بۆنی چو و بە سەریاندا ، ئەوە وەكو ئەوە وایە ئەو ئافرەتە داوێن پیسی كرد بێت .

6. **نابێت پۆشاكەكەی لە سەر شێوازی جلو بەرگی پیاوان بێت :** لە (**أبو هريرة**) ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە كە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: " لعن رسول الله ﷺ الرجل يلبس لبسة المرأة والمرأة تلبس لبسة الرجل "[2].

---

[1] حسنه العلامة الألباني في : ( صحيح سنن النسائي : 5126 ) ، و ( صحيح وضعيف الجامع : 2701 ) ، و ( صحيح الترغيب والترهيب :2019 )، وە **بڕوانە** :( جلباب المرأة المسلمة : 137 ) .

[2] صححه العلامة الألباني في : ( صحيح سنن أبي داود 4098 ) ، و ( صحيح الترغيب والترهيب :2069 ) ، وە **بڕوانە**: ( جلباب المرأة المسلمة :141 ) .

واته : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نه‌فره‌تی كردووه له‌و پیاوه‌ی كه جل‌و به‌رگی ئافره‌تان له به‌ر ده‌كه‌ن ، وه ئه‌و ئافره‌تانه‌ش كه جل‌و به‌رگی پیاوان له‌به‌ر ده‌كه‌ن [1] .

7. **نابێت پۆشاكه‌كه‌ی له سه‌ر شێوازی جل و به‌رگی ئافره‌تانی بێباوه‌ڕ بێت :** له ( **عبدالله** ) ی كوڕی ( **عمر** )ه‌وه ده‌گێڕنه‌وه كه فه‌رموویه‌تی : پێغه‌مبه‌ری خواﷺ دوو جلی( **معصفر** [2] ) ی له به‌ردا بینی ، وه فه‌رمووی :" إن هذه من ثياب الكفار فلا تلبسها [3] ، واته : ئه‌م جلانه جلی بێباوه‌ڕانه مه‌یان پۆشه .

8. **نابێت خۆی له خۆیدا ڕازاوه‌یی و جوانی تێدا بێت :** له به‌ر فه‌رمووده‌ی خوای گه‌وره كه ده‌فه‌رمووێت: ﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾

---

[1] وه‌ك : پانتۆڵ ، هیچ جیاوازیش نیه له‌وه‌ی كه پانتۆڵه‌كه ئاشكرا بێت یان له ژێره‌وه‌ی پۆشاكی مانتۆدا بێت ، مانتۆكه كورت بێت یان درێژ ، له ماڵه‌وه بێت بۆ مێرده‌كه‌ی یان له ده‌ره‌وه له پێش چاوی خه‌ڵك ، چونكه جلێكی تایبه‌ته به پیاوانه‌وه ، نابێت ئافره‌تان بیپۆشن، یان هه‌ر پۆشاكێكی تایبه‌تی تر به پیاوان كه ئافره‌تان ده‌یپۆشن( **مامۆستا عدنان** ).

[2] **المُعَصْفَر** : ئه‌و پۆشاكه‌یه كه به ڕووه‌كی ( عَصْفَر ) ڕه‌نگ ده‌كرێت ، كه ڕه‌نگێكی سوری زۆر تۆخی لێ ده‌رده‌كرێت .

[3] ( مسلم : 2077 ، و 27 ).

. واتە: با ئافرەتان جوانیەکانیان دەرنەخەن، وە خوای[1]
پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى ﴾[2]. واتە: لە ماڵەکانتان بمێننەوە و لەکاتی دەرچوونتاندا خۆتان ڕووت نەکەنەوە، هەروەك چۆن ئافرەتان لە سەردەمی نەفامیدا خۆیان ڕووت دەکردەوە .

وە لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە تێیدا دەفەرمووێت : " ثلاثة لا تسأل عنهم ــ وذكر منهم ــ : ... وامرأة غاب عنها زوجها ، قد كفاها مؤونة الدنيا ، فتبرجت بعده ... "[3].

واتە: سێ جۆر کەس هەن ـ لە گەورەیی تاوانیان ـ سەبارەتیان هیچ پرسیارێك مەکە: یەکێك لەوانەی کەباسی کردووە: ئافرەتێکە پیاوەکەی لە لا نەبێت، بژێوی ڕۆژانەشی بۆ دابین کرد بێت، و بەجێ هێشتوو بێت، کەچی ئەو لە پاش ئەو خۆی بڕازێنێتەوە، و جوانیەکانی خۆی دەربخات .

---

[1] ( سورة النور : 31 ) .
[2] ( سورة الأحزاب : 33 ) .
[3] صححه العلامة الألباني في : ( الصحيحة : برقم : 542 ) .

وە هەروەها لە بەر ئەم فەرموودەیەش کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێدا فەرموویەتی : " وشر نسائكم المتبرجات المتخيلات ، وهن المنافقات ، لا يدخل الجنة منهن إلا مثل الغراب الأعصم " [1].

واتە : خراپترینی ئافرەتەكانتان ئەو ئافرەتانەن كە جوانیەكانی خۆیان دەردەخەن، وە خۆ دەڕازێننەوە، و ە لە خۆ ڕازین و فیز و تەكەبر دەكەن بە سەر ئافرەتانی تردا، بەڕاستی ئەوانە خۆ دەشوبهێنن بە دوو ڕووان، هیچ یەكێك لەوانە ناڕواتە بەهەشتەوە، ئیللا وەكو قەڵە بازەڵە نەبێت ( كە جۆرێكە لە قەلە ڕەش باڵەكانی یان پێكانی سپین )، هێنانەوەی ئەم شێوەیە لە قەلە ڕەش بە نموونە بە هۆی كەمیانەوەیە، بۆ ئاماژە كردنە بە كەمی ئەو ئافرەتانەی كە دەڕۆنە بەهەشتەوە .

ئا ئەمەیە مەرجەكانی پۆشاكی شەرعی تەواو كە پۆشاكەكەت دەكەن بە پۆشاكێكی شەرعی، ئەو پۆشاكەی بە پۆشینی گوێڕایەڵی خۆت دەر دەبڕیت بۆ خوای گەورە، هەر ئەوەشە كە بە پۆشینی پارێزراو دەبیت لەو گورگانەی كە ئەیانەوێت تۆ دەركەویت، و بە ئارەزووی خۆیان بە تۆ ڕابوێرن .

---

[1] صححه العلامة الألباني في :( الصحيحة ، برقم :1849 ) .

**خوشكەكەم :** ئەگەر تۆ ئەم داواكاریە تەواو و تێرو تەسەلەی پەروەردگارت لە ڕواڵەتدا بە دی هێنا، بە تەواوی و شكۆداری و بە لەسەر خۆی و، هەیبەتەوە ، و لە هەموو جموجوڵتدا، ئەوا ڕووناكی یە لە سەر ڕووناكی، بێگومان ڕوواڵەتیش بە تەنها بەس نییە بە بێ ناوەڕۆك ، بۆیە ئافرەتان فەرمان پێكراون بە پاراستنی هەموو جموجوڵێكیان ، لە گەڵ پاراستنی چاو و زمانیان ، هەروەها چاودێری كاری عەقڵ و دەروونی خۆی بێت، و زاڵیش بێت بە سەریدا ، و زیاتر شەرمو حەیای پێوە دیار بێت، و كەمیش بدوێت ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ [1] واتە : بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ كە چاویان لە تەماشاكردنی حەرام بپارێزن، داوێنیشیان بپارێزن لە داوێن پیسی، جوانیەكانیشیان دەرنەخەن، جگە لەوەی نەبێت كە بەبێ دەسەڵاتی ئەوان دەردەكەوێت .

وَآخِرُ دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ
وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

# دیاریەك بۆ خوشكەكەم

(1) ( سورة النور : 31 ) .

چە پکە گوڵێك لە باخچەکانی ئامۆژگاری بۆ خوشکان

## (( تا گەنجیت ))

خوشکەکەم ئێستا بەهاری ژینتە گەشاوەی گەشی

گوڵی سەدتەرزی، ڕازاوەو بەرزی، جوان وبۆن وەشی

زەردەواڵەو مێش، کوللەو مێشوولە، لە پەلاسدان بۆت

گەر ووریا نەبی دووچاری لە کەو دوا ڕۆژی ڕەشی

سبەی پایزە هەورە تەمە و دوو، زووقم و تەزینە

سیسی و ژاکاوی و گەلاڕێزانە، کاتی وەرینە

ئەوکاتە هیچ کام نایەن بەلاتا، حاشات لێ دەکەن

خوشکم ئەوانە کارو پیشەیان هەر دەست بڕینە

خوشکم ئەوانە ئێستا تا مەزرۆن بۆ یەك نێو نیگات

ئامادەن ببنە کۆچی قوربانی هەنگاوی ڕێگات

گەر نەخوازەلا بەردەستیان کەوی تاسەیان بشکێت

بەرەلات ئەکەن ،دەربەست نین دۆزەخ ببێتە جێگات

## چەپکە گوڵێك لە باخچەكانی ئامۆژگاری بۆ خوشكان

خوشكم ئەبینی تۆ بە چاوی خۆت گوڵ و گوڵاڵە

كامیان قەشەنگ و جوان وبۆن خۆشە، ڕەنگین و ئاڵە

لەسەرەتاوە چەندە تاسوخە، چەند بازاڕگەرمە

كە ژاكا جێگەی تەنەكەی زبڵە، سەنێرگەو چاڵە

هەتاكو گەنج بوون جوان ودڵ فڕێن، تا شای تەمەن بوون

شەوچەرەی ( مەلها )و ئەستێرەی گەشی ئاسمانی( فەن بوون )

لای هەرزەو نەزان، نمونەی ژین و زۆر بەهرە مەند بوون

پیریان لێ نیشت بەرەلاكران، ڕیسواو بە پەن بوون.

سروەی بێداری ( جمال حبیب الله ) ل:170-171

# حوكمی
# عابای ئافرەتان
# و
# مەرجەكانی

ئامادەكردنی

مامۆستا عدنان بارام

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ هەموو گەوهەرەیەكی بەنرخ ، بۆ مرواریە پارێزراوەكان، بۆ ئەو ئافرەتانەی كە بڕیاریان داوە پۆشاكی شەرمو حەیا لە بەر بكەن،

چونكه فه‌رمانی په‌روه‌ردگاریانه ، ئه‌وه‌ش ته‌نها له به‌ر ڕه‌زامه‌ندی ئه‌و، بۆ ئه‌وه‌ی به به‌هه‌شتی به‌رین شاد بن .

**بۆ تۆ خوشكی موسڵمانم** : كه پێشه‌وات خێزانه به‌ڕێزه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوایه ﷺ، بۆ تۆ كه پاپه‌ندی ئایه‌ته پیرۆزه‌كانی قورئانی‌و فه‌رمووده‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوایت ﷺ، نه‌ك پابه‌ندی مۆده‌و سه‌رگه‌ردانبووی شوێنی ئه‌م و ئه‌و .

**بۆ ئه‌و خوشكانه‌م** : كه نایانه‌وێ هه‌ڵخه‌ڵه‌تاوی ئه‌و كه‌سانه بن كه به‌ناو مافه‌كانیانه‌وه ئه‌یانه‌وێ پۆشاكی حیشمه‌تی له به‌ر داكه‌نن، ئه‌وه‌ش نه‌ك له به‌ر ئافره‌تان به‌ڵكو له به‌ر تێركردنی ئاره‌زووه گڵاوه‌كانیان، بۆ ئه‌وه‌ی له كۆتایدا تۆی به‌ڕێز وه‌كو گوڵێكی گه‌ڵا هه‌ڵوه‌ریو به جێ بهێڵن !! دوای ئه‌وه‌ی وه‌كو بوكه شووشه‌ی ده‌ستی منداڵان یاری خۆیانت پێده‌كه‌ن !!!

**گه‌وهه‌ره به‌نرخه‌كه‌م** : له‌م نووسراوه‌دا ئه‌وه‌ت بۆ ڕوون ده‌كه‌مه‌وه كه ئه‌گه‌ر تۆی به‌ڕێز كه‌وتیته به‌رچاوی نامه‌حره‌مان ئه‌بێ چیت به‌سه‌ره‌وه بێت ؟ و مه‌رجه‌كانیشی چیه‌ ؟ بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و عیباده‌ته‌ی كه بڕیارت داوه كه ئه‌نجامی بده‌یت ( كه حیجابه‌كه‌ته ) بێ كه‌م‌و كوڕی بێت‌و تیرو ته‌سه‌لتر بێت، بۆ ئه‌وه‌ی ڕه‌زامه‌ندی

پەروەردگارت بە دەست بهێنیت، و گەواهیەکی تەواویش بێت لە سەر ئیمانەکەت، و پارێزەرێکیش بێت بۆ پاراستنت لە دونیاو دوا ڕۆژیشدا. داواکارم پەروەردگار زیاتر یارمەتی دەری من و تۆش بێت بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیو پابەندبوون بە ئاینە پیرۆزەکەی .

**خوشکی بەڕێزم** : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (سورة الأحزاب : 59) .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزانو کچەکانتو ئافرەتی بڕواداران بڵێ با جلبابەکانیان ( جلبابیش : واتە : عابا ) بدەن بە خۆیاندا، ئەوەش نزیك ترە بۆ ئەوەی کە بە ڕەوشت بەرز و بە حەیا و حیشمت و قورس و سەنگینی بناسرێنەوە، تا ئەزیەت و ئازار نەدرێن، پەروەردگاری تۆش لێبووردە و میهرەبانە .

## تەفسیر و ڕاڤەی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز :

(ابن كثير) **ـ بە ڕەحمەت بێت ـ فەرموویەتی :** (يقول الله ـ تعالـى ـ آمراً رسوله ﷺ تسليماً أنْ يأمر النساء المؤمنات ـ خاصة أزواجه وبناته لشرفهن ـ بأنْ يُدنين عليهن من جلابيبهن ليتميزن عن سمات نساء الـجاهلية وسمات الإماء ، والـجلباب هو الرداء فوق الـخمار، قاله ابن مسعود وعبيدة وقتادة والـحسن البصري وسعيد بن جبير وإبراهيم النخعي وعطاء الخراسانـي) [1].

**واتە : خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە فەرمان بکات بە ئافرەتانی بڕوادار ـ بە تایبەت خێزان و کچەکانی لە بەر ڕێز و پلەیان ـ کە ( جلبابەکانیان ) بە خۆیاندا بدەن، بۆ ئەوەی جیا بکرێنەوە لە شێوە و شێوازی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی، و شێوەو شێوازی ئافرەتانی کەنیزەك، (** جلباب **) یش ئەو پۆشاکەیە کە لە سەرەوەی سەرپۆشدا ئافرەتان دەیدەن بە خۆیاندا ( واتە : عابا )، ئەمەش ووتەی :** ( ابن مسعود وعبيدة وقتادة والحسن البصري وسعيد بن جبير وإبراهيم النخعي وعطاء الخراسانـي ) **یە .**

**هەروەها (** القرطبـي **) ش ـ بەڕەحمەت بێت ـ سەبارەت بە تەفسیری ووشەی (** جلابيب **) فەرموویەتی :**(جمع جلباب : وهو ثوب أكبر من الـخمار، وروي عن ابن عباس وابن مسعود: أنه الرداء ، وقد

---

(1) تفسير القرآن العظيم لابن كثير : ( 3 / 1510 ) .

قيل: إنه القناع ، والصحيح أنه الثوب الذي يستر جميع البدن وفـــي "صحيح مسلم" [1] عن أم عطية قلت : يا رسول الله ﷺ إحدانا لا يكون لـــها جلباب ؟ قال : لتلبسها أختها من جلبابـــها) [2].

**واته : ئەم ووشەیە كۆیە و تاكەكەشى (**جلباب**)ـه : كە بریتىيە لە پۆشاكێكى گەورەتر لە سەرپۆش، وە دەشگێڕنەوە لە(**ابن عباس**), و (** ابن مسعود **) ﵄ فەرموویانە: (** جلباب **: بریتىيە لەو پۆشاكەى كە سەر شان و پشت و پێش پێ دادەپۆشرێت تا ئاستى ناوك )، وە ووتراوە: (**قناع**)ـه كە بریتىيە لەو پۆشاكەى كە هەندێك فراوانتر و گەورەترە لە سەرپۆش) ، بەڵام ووتەى ڕەوا ئەوەیە بوترێت: ئەو پۆشاكەیە كە هەموو لەش داپۆشێت، هەروەكو لە "**صحيح مسلم**" دا هاتووە لە (** أم عطية **) ەوە كە فەرموویەتى : ووتم : ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەى ئەگەر یە كێكمان عاباى نەبوو ؟ فەرمووى: با خوشكەكەى لە عاباكانى خۆى بداتى و لە بەرى بكات .**

**شێخى پایە بەرزى ئیسلام و فەرموودە ناسى سەردەم (** محمد ناصرالدين الألبانـــي **) بە ڕەحمەت بێت فەرموویەتى :(**ثُمَّ إنَّ الله تعالى

---

[1] صحيح البخاري رقم : (324) وصحيح مسلم رقم : (890) .

[2] تفسير القرطبـــي : (14 / 243) ، **هەروەها بڕوانە :** "فتح القدير" للشوكانـــي :(4 / 304) .

... **أمرها** ــ في الآية الأخرى ــ **إذا خرجت من دارها أن تلتحف فوق ثيابها وخمارها بالجلباب أو الملاءة لأنه أستر لها وأشرف لسيرتها** وهي قوله تعالى : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (سورة الأحزاب : 59) ... **والجلباب : هو الملاءة التي تلتحف به المرأة فوق ثيابها على أصح الأقوال** وهو يستعمل في الغالب إذا خرجت من دارها كما روى الشيخان و غيرهما عن أم عطية رضي الله عنها قالت : " أمرنا رسول الله ﷺ أن نخرجهن في الفطر والأضحى: العواتق والحيض وذوات الخدور فأما الحيض فيعتزلن الصلاة ويشهدن الخير ودعوة المسلمين . قلت : يا رسول الله إحدانا لا يكون لها جلباب ؟ قال : لتلبسها أختها من جلبابها "[1].

قال الشيخ أنور الكشميري في ( فيض الباري ) ( 1 / 388 ) تعليقا على هذا الحديث : ( **وعلم منه أن الجلباب مطلوب عند الخروج وأنها لا تخرج إن لم يكن لها جلباب** .

**والجلباب رداء ساتر من القرن إلى القدم** )[1] .

---

[1] صحيح البخاري رقم : (974) وصحيح مسلم رقم : (890) وصحيح سنن أبي داود رقم : (1124) وصحيح سنن الترمذي رقم : (537) .

[1] جلباب المرأة المسلمة : (82 ــ 84) .

واتە: پاشان خوای پەروەردگار ... فەرمانی پێکردووە ـ لە ئایەتەکەی تردا ـ ئەگەر لە ماڵ چووە دەرەوە ، ئەوا لە سەرووی پۆشاك و سەرپۆشەكەشیەوە (جلباب) یان (عابا) بدات بە خۆیدا، چونكە ئەوە زیاتر دەیپارێزێت، و سەنگینترە بۆ ڕێكردنی، ئەوەش لەم ئایەتەدا كە خوای پەروەردگار تێیدا فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ .

**جلبابیش :** بریتی یە لە عابا كە ئافرەت خۆی پێدادەپۆشی لە سەر هەموو پۆشاكەكانیەوە ، لە ڕەوا ترین ووتەی زانایان ، ئەوەش زیاتر بە كاردەهێنرێت لە كاتی دەرچوونیدا لە ماڵ ، هەروەكو دوو شێخی پایە بەرز (البخاري و مسلم ) و جگە لەوانیش بۆمان دەگێڕنەوە لە ( أم عطية )ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ كە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكردین كە ئەمانە دەربكەین لە گەڵ خۆماندا : (كچانی پێگیشتو و ئەوانەش كە لە بێنوێژیدان و ئەوانەش لە ( خدردان / كە جێگایەكی تایبەتە بۆ كچان لە ماڵدا) سەبارەت بەوانەی كە لە بێ نوێژیدان ( حيض ) نوێژیان لە سەرنیە ، بەڵام خێر و پاڕانەوەی موسڵمانان دەبینن . دەڵێت : ووتم : ئەی

پێغەمبەری خواﷺ ئەی ئەگەر یە کێکمان عابای نەبوو ؟ فەرمووی : با خوشکەکەی لە عاباکانی خۆی بداتی و لە بەری بکات .

شێخ ئەنوەری کشمیری لە (فيض الباري ) لە ( 1 / 388 ) دا سەبارەت بەم فەرموودەیە فەرموویەتی: **" لەم فەرموودەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە جلباب پێویستە لە کاتی دەرچووندا ، وە ناشبێت بڕواتە دەرەوە ئەگەر جلبابی نەبێت .**

**جلبابیش : پۆشاکێکە سەرتا پای ئافرەت دادەپۆشێت "** .

وە زانای پایە بەرزی ئیسلام شێخ( **ابن باز**) - بە ڕەحمەت بێت - لە واتای ( **جلابيبهن** ) فەرموویەتی : ( والــجلباب ما يوضع على الرأس والبدن فوق الثياب ، وهو الذي تغطي به النساء الرأس والوجه والبدن كله ... ) [1] .

وە لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی : (والــجلباب : هو الرداء فوق الــخمار بــمنــزلة العباءة ) [2] .

**واتە: جلباب ئەو پۆشاکەیە کە ئافرەتان لە سەرەوەی جلەکانیانەوە بە خۆیاندا دەیدەن ، و سەرتا پایان دەگرێتەوە .**

---

[1] ( 6 ) فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز ، السؤال السابع ضمن (أسئلة وأجوبة بعد محاضرة "عمل الــمسلم") .

[2] ( 7 ) فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز ، ضمن رسالة : (الاختلاط والسفور) .

**پاشان فەرموویەتی :** (ومن أدلة السنة أن النبي ﷺ لما أمر بإخراج النساء إلى مصلى العيد قلن : يا رسول الله إحدانا لا يكون لـــها جلباب ؟ فقال : النبي ﷺ : " لتلبسها أختها من جلبابـــها " ( رواه البخاري ومسلم ) [1] .

فهذا الـــحديث يدل على أن الـــمعتاد عند نساء الصحابة ألاَّ تخرج الـــمرأة إلاَّ بـــجلباب ) [2].

**واتە : وە لە بەڵگەكانی سوننەت ئەو فەرموودەیەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا كاتێك فرمانی كرد بە دەرچوونی ئافرەتان بۆ شوێنی نوێژی جەژن ، فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر یە كێكمان عابای نەبوو ؟ فەرمووی : با خوشكەكەی لە عاباكانی خۆی بداتی و لە بەری بكات .**

**ئەم فەرموودەیەش ئەوە دەگەیەنێت كە لەو سەردەمەدا ئەوە باو بووە لە ناو ئافرەتانی صەحابەدا كە نابێت ئافرەتان لە ماڵ بڕۆنە دەر بەبێ عابا .**

**هەروەها فەرموویەتی :** (والـــجلباب : لباس تضعه المرأة فوق رأسها وعلى جميع بدنها فوق ثيابها العادية لمزيد الستر والبعد عن الفتنة .

---

(1) صحيح البخاري رقم : (324) وصحيح مسلم رقم : (890) .

(2) فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز .

هكذا ينبغي للمرأة سواء كانت بدوية أو حضرية ، الواجب عليها أن تتمسك بحكم الإسلام وأن تجتهد في ستر عورتها ...)[1] .

**واتە : جلباب : پۆشاكێكە ئافرەتان دەیدەن بە سەر سەر و هەموو لەشیاندا لە سەرەوەی پۆشاكە ئاساییەكانیانەوە ، بۆ زیاتر پۆشین و دووركەوتنەوە لە فیتنە . ئەم شێوەیە پێویستە لە سەر ئافرەتان ، خەڵكی گوندو لادێ بێت ، یان خەڵكی شارەكان ، پێویستە لە سەری پابەند بێت بە حوكمی ئیسلامەوە ، و كۆشش بكات و هەوڵبدات بۆ داپۆشینی عەورەتی ...**

**جارێكی تر شێخ ( محمد ناصر الدين الألباني ) بەرەحمەت بێت فەرموویەتی :** (فالــحقُ الذي يقتضيه العمل بــما في آيتــي النور[2]

---

[1] فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز .

[2] **مەبەستی ئەم ئایەتەیە :** ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (سورة النــــور : 31) .

والأحزاب[1] : أنَّ الــمرأة يجب عليها إذا خرجت من دارها أن تختمر وتلبس الجلباب على الخمار لأنه كما قلنا سابقا أستر لها وأبعد عن أن يصف حجم رأسها وأكتافها وهذا أمر يطلبه الشارع)[2].

**واتە : بە پێی دوو ئایەتی سورەتی** ( النور ) و ( الأحزاب ) **ئەوە پێویست دەبێت کە ئافرەت ئەگەر دەرچوون لە ماڵەکەی ، خۆی داپۆشێت بەوەی کە لە سەر سەرپۆشەکەیەوە عابا بدات ، چونکە ئەوە ـ هەروەکو لە پێشدا ووتمان ـ پۆشتە ترە بۆیان ، و دوورترە لەوەی کە قەبارەو شێوەی سەر و شانی دەربخات ، ئەوەش کردارێکە شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز لە ئافرەتان داوای دەکات .**

**وە فەرموویەتی :** (واعلم أن هذا الجمع بين الخمار والجلباب من المرأة إذا خرجت قد أخل به جماهير النساء المسلمات فإن الواقع منهن إما الجلباب وحده على رؤوسهن أو الخمار وقد يكون غير سابغ في بعضهن كالذي يسمى اليوم بــ( الإشارب ) بحيث ينكشف منهن بعض ما حرم الله عليهن أن يظهرن من زينتهن الباطنة كشعر الناصية أو الرقبة مثلا)[3].

---

[1] **مەبەستی ئەم ئایەتەیە :** ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (سورة الأحزاب : 59) .

[2] جلباب الــمرأة الــمسلمة ص : (85) .

[3] جلباب الــمرأة الــمسلمة ص : (85) .

واتە : بزانە ئەوەی کە پێویستە لە سەر ئافرەتان لە سەرپۆش و عابا دان لە گەڵ یەکدا لە کاتی دەرچونیاندا ، ئافرتانی موسڵمان زۆربەیان کەمتەرخەمن تیایدا ، چونکە هەروەکو لە واقعدا ئەبینرێن یان عابا بە تەنها دەدەن بە سەریاندا ، یان سەرپۆش ، جاری واش هەیە داپۆشەری تەواو نیەیە لە هەندێکیاندا ، وەکو ئەوەی کە ئەمڕۆ پێی دەووترێت ( الإشارب ) بە شێوەیەك هەندێك لەو بەشانە دەردەکەوێت کە خوای پەروەردگار حەرامی کردووە لە سەریان دەریخەن لە جوانیەیە شاراوەکانیان ، وەك پرچی پێشە سەریان یان گەردنیان بۆ نمونە .

## عابا تەنها بۆ کاتی دەرچوون نی یە لەماڵ !

شێخ ( **محمد ناصر الدین الألباني** ) بەرەحمەت بێت لە ڕوون کردنەوەیەك دا سەبارەت بە ووتەی شێخ (أنور الكشميري ) فەرموویەتی : (ثُمَّ إنَّ قوله : ( والجلابيب عند الخروج ) لا مفهوم له إذ إن الجلباب لستر زينة المرأة عن الأجانب فسواء خرجت إليهم أو دخلوا عليها فلا بد على كل حال من أن تتجلبب ويؤيد هذا ما قاله قيس بن زيد : ( صحيح ) ( إنَّ رسول الله ﷺ طلق حفصة بنت عمر ... فجاء رسول الله ﷺ فدخل عليها فتجلببت فقال رسول الله ﷺ : " إن جبريل أتانـــي

فقال لـــي أرجع حفصة فإنـــها صوامَّـــة قوامَّـــة ، وهي زوجتك فـــي الـــجنة " ) [1] .

**واتە : پاشان کە شێخ دەفەرمووێت : "عابا لە کاتی دەرچووندا دەبێت " هیچ واتایەکی لێرەدا نیيە ، چونکە عابا بۆ شاردنەوەی جوانی ئافرەتانە لە نامەحرەم ، وەك یەکە ئەگەر ئەم بڕواتە دەروە ، یان ئەوان بڕۆنە ژوورەوە ، کە پێویستە لە هەردوو بارەکەدا هەر عابا بدات بە سەریدا ، ئەوەش پاڵپشتی ئەم ووتەیە بکات ئەو ووتەیەیە کە** ( قيس ) **ی کوڕی** ( زيد ) **فەرموویەتی :**

**کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی کچی عومەری تەڵاق دا ... پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای ئەویش عاباکەی بە دا خۆیدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : جبریل هاتۆتە لام پیٚی فەرمووم : حەفصە بگەڕێنەوە چونکە زۆر بە ڕۆژوو دەبێت و بە زۆریش شەونوێژ دەکات ، خێزانیشتە لە بە هەشت دا .**

---

[1] (سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (2007) و "جلباب الـــمرأة الـــمسلمة" ص : (87) .

## مەرجەكانی عابای ئافرەتان

(**اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء**) لە فەتوای ژمارە (21352) ەیان دا ، لە بەرواری (9 / 3 / 1421**ك**) دا سەبارەت بەپرسیارێك فەرموویانە [1] :

( شوكر و ستایش تەنها بۆ پەروەردگار و درووود و سەلامیش لە سەر ئەو پێغەمبەرە بێت كە هیچ پێغەمبەرێكی بە دوادا نایەتﷺ .. پاشان : (اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء) چاوی خشاندووە و بەئاگایە لەو پرسیارەی كە لە لایەن(عبد العزيز الدهام) ەوە كراوە لە بەڕێز جەنابی موفتی هەموو وڵات ، كە لە ویشەوە نێردراوە بۆ(اللجنة من الأمانة العامة لهيئة كبار العلماء) بە ژمارەی (934) و لە بەرواری (12 / 2 / 1421) ی كۆچی دا .

تیایدا پرسیاركار پرسیارێك دەكات ئەمە دەقەكەیەتی : " لەو دواییانەدا عابایەك بڵاو بووەتەوە بەشێوەی لەش دەدووررێت ، و تەسكیشە ، و لە دوو پارچەی تەنك لە قوماشی ( كرپ ) درووست

[1] اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء ، **بە سەرۆكایەتی** :( الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن محمد آل الشيخ ) ، **و ئەندامێتی هەریەك لە** (الشيخ صالح بن فوزان الفوزان) ، و (الشيخ عبدالله بن عبد الرحمن الغديان) ، و (الشيخ بكر بن عبدالله أبو زيد) .

دەكرێت و دوو دەربالّی فراوانیشی هەیە ، نەخش و تەتریزیشی پێوەیە ، و دەدرێت بە سەر شاندا [1] .

جا حوكمی شەرع چیە سەبارەت بەم جۆرە عابایانە ؟ وەلاّممان بدەنەوە خوای پەروەردگار پاداشتان بداتەوە ، پێشنیاری ئەوەش دەكەم ـ خوای پەروەردگار بتانپارێزێت ـ كە ووتەیەك ئاراستەی وەزارەتی بازرگانی بكەن بۆ ڕێگرتن لەم جۆرە عابایە وهاوشێوەكانی " .

وە دوای لێكۆڵینەوە و تاوتوێكردنی لیژنە بەم شێوە وەلاّم دەداتەوە كە عابای شەرعی بۆ ئافرەت بریتیەیە لە (الـــجلباب) : كە بریتیەیە لە ئەوەی كە مەبەستی شەرعی پێ جێبەجێ دەبێت لە داپۆشینی تەواو ، دوركەوتنەوە لە فیتنە ، لە سەر ئەم ووتەیەش پێویستە عابای ئافرەتان ئەم مەرجانەی تێدا بێت :

**یەكەم :** ( أن تكون سميكة لا تظهر ما تحتها ، ولا يكون لـــها خاصية الالتصاق ) ، واتە : ئەبێت ئەستووربێت ، بە شێوەیەك ئەوەی

---

[1] **تێبینی :** ئەم جۆرە عابایە لە كوردستانی خۆماندا پێی دەوترێت (عابای خەلیجی) ، وە لە وولاّتانی خەلیجدا پێی دەوترێت (عابای فەرەنسی) ، وە شایەنی بیرخستنەوەیە سەپاندنی ناوی (عابا) بە سەر ئەم جۆرە پۆشاكە سەرنج ڕاكێش و ڕازراوەیەدا كە دەدرێت بە سەر شاندا یەكێكە لە پیلان و فێڵ و داوەكانی شەیتان و شوێنكەوتووەكانی بۆ سەرشێواندن لە ئافرەتی موسڵمانان .

لە ژێریدایە دەری نەخات ، و بە لەشیشەوە نەلکێت ( واتە : سیفەتی لاستیکی تێدا نەبێت ) .

**دووەم :** ( أن تكون ساترة لـــجميع الـــجسم ، واسعة لا تبدي تقاطيعه ) ، **واتە : ئەبێت هەموو لەش دابپۆشێت ، و فراوانیش بێت بەشەکانی لەش دەرنەخات .**

**سێیەم :** ( أن تكون مفتوحة من الأمام فقط ، وتكون فتحة الأكمام ضيقة ) ، **واتە : ئەبێت تەنها لە پێشەوە کرابێتەوە ، و دەرباڵەکانیشی تەسك بێت .**

**چوارەم :** ( ألاّ يكون فيها زينة تلفت إليها الأنظار ، وعليه فلا بد أن تخلو من الرسوم والزخارف والكتابات والعلامات ) ، **واتە : ئەبێت هیچ جۆرە جوانیەکی تێدا نەبێت سەرنجی دەور و بەر بۆ خۆی ڕابکێشێت ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەبێت دوور بێت لە هەموو وێنە و زەخرەفە و نووسین و نیشانەیەك .**

**پێنجەم :** ( ألاّ تكون مشابــهة للباس الكافرات أو الرجال ) ، **واتە : ئەبێت هاوشێوەی پۆشاکی ئافرەتانی بێ بڕوا نەبێت ، یان هاوشێوەی پۆشاکی پیاوان .**

**شەشەم :** (أن توضع العباءة على هامة الرأس ابتداءً ) ، **واتە : ئەبێت سەرەتاکەی بدرێت بە سەر سەردا نە شوێنی تر .**

لە سەر هەموو ئەوەی پێشوو ، ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو عابایەی لە پرسیارەکەدا باسکرا عابایەکی شەرعی نییە بۆ ئافرەتان ، بۆیە نابێت لە بەر بکرێت ، چونکە ئەو مەرجانەی تێدا نییە کە پێویستە تێیدا هەبێت ، هەروەها نابێت هیچ عابایەکی تر لەبەر بکرێت کە ئەو مەرجە پێویستانەی تێدا نەبێت ، وە ناشبێت وەکو شتومەکی بازرگانی بهێنرێت ، و دروست بکرێت ، بفرۆشرێت ، و بایەخی پێ بدرێت لە ناو موسڵمانان‌دا ، چونکە ئەوە بەشداری کردنە لە سەر تاوان و ستەم کردن ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی : ﴿ وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ (المائدة : 2) .

وە لیژنەش کە ئەوە ڕوون دەکاتەوە ، ئامۆژگاری ئافرەتانی بڕوادار دەکات بەوەی لە خوا بترسن و پابەندی تەواوی خۆداپۆشین بن بۆ جەستەیان ئەوەش بە عابا و سەرپۆش دان لە پیاوانی نامەحرەم ، ئەوەش گوێڕایەڵی بێت بۆ خوای پەروەردگار ، و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە بۆ دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی فیتنە و تووشی فیتنە کردن .

**سەرکەوتنیش تەنها لە لای خوای پەروەردگارە .**

وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم

## فەتوایەکی شێخ ( ابن العثیمین )
## و ئامۆژگاری بۆ ئافرەتان [1] :

**پرسیار :** ما حكم لبس العباءة التي في أطرافها ، أو أكمامها قيطان أو غيره ؟ واتە : حوکمی پۆشینی ئەو عابایە چی کە لە لاکانی ، یان لە دەربالەکانی قەیت یان جگە لەوە هەیە ؟

**وەڵام :** محرم حيث أنه يؤدي إلى الفتنة . واتە : حەرامە چونکە ئەبێتە هۆی فیتنە .

پاشان ئامۆژگاری ئافرەتان دەکات و دەفەرمووێت :

**خوشکی موسڵمانم** : ژیری و بیری خۆت بکە بە دادوەر و باش تێڕوانین بکە لە پۆشینت بۆ عابا ، ئایا ڕێی تێدەچێت جوانیەك بە جوانیەکی تر داپۆشی ! وە ئایا حیجاب بۆ ئەوە شەرع نەکراوە کە ئەو جوانییە داپۆشێت ! ! ؟ جا با چاوڕۆشن بین لە کردارەکانماندا ، وە ئەوەش بزانین : کە دوژمنانی ئیسلام پیلان دەگێڕن دژ بە حیجاب ، جا ئەی خوشکی موسڵمانم خۆت رزگار کە ، چونکە خۆشی دونیا خۆشیەکی کەمە ، دوارۆژ یش باشترە بۆ لە خوا ترسان ، نەکەی بوغرا بیت بە سامان ومالەکەت ! ! وە بە جوانییەکەت ! ! ! چونکە ئەو شتانە هیچ سوودت پێناگەیەنن لە لای خوا ! ! !

---

[1] موسوعة الفتاوى الإسلامية ، رقم الفتوى : (4527) .

منیش لێرەدا ئەوەت یاد دەخەمەوە و دەتترسێنم بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگری دۆزەخیان پیٚپیشان دراوە ، و زۆربەی ئەهلی دۆزەخ ئافرەت بووە ، وە ئاگادارت دەکەمەوە لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە ئافرەتان فەرموویەتی کە تۆش یەکێکیت لیٚیان : "اتقوا الدنيا واتقوا النساء ، فإنَّ أول فتنة بني إسرائيل كانت في النساء" [1] ، واتە : لە فیتنەی دونیا بترسن و لە فیتنەی ئافرەتان ، چونکە یەکەم فیتنەی بەنی ئیسرائیل فیتنەی ئافرەت بووە ، وە خۆت ڕزگار بکە لە ئاگری دۆزەخ ، ئەوەش بزانە تۆ زۆر لەوە لاواز تری بەرگەی ئەو ئاگرە بگریت ، چونکە ئەگەر کێوەکان بخرێنە ناو ئەو ئاگرە دەتوێنەوە ، جا تۆ چیت ئەگەر بەراورد بکرێیت لە گەڵ ئەو کێوە سەرکەسانە ؟! جا خۆت ڕزگار بکە لەو ئاگرە ، و وەڵامی بانگەشە خوازی ڕەوایی بدەوە ، بشزانە : "أنَّ من ترك شيئاً لله عوضه الله خيراً منه" [2] ، واتە : ئەو کەسەی لەبەر

---

[1] صحيح مسلم رقم : (2742) .

[2] صحَّ هذا الـــحديث بلفظ : "إنَّك لن تدع شيئاً لله عزَّ وجل ، إلاَّ بدَّلك اللهُ به ما هو خير لك منه" أخرجهُ وكيع فــي "الزهد" : ( 2 / 68 / 2) ، وعنه أحمد : ( 5 / 363) ، والقضاعـــي فـــي " مسند الشهاب" رقم : (1135) وسندهُ صحيح علـــى شرط مسلم قالهُ الشيخ الـــمحدِّثُ العلاَّمـــة الإمام الألبانـــي رحمه الله فـــي " سلسلة الأحاديث الضعيفة" : (1 / 61 ــ 62) ، أمَّـــا اللفظ الذي ذكرهُ الشيخ العلاَّمـــة ابن العثيمين رحمهُ الله فرغم

ڕه‌زامه‌ندی خوای په‌روه‌ردگار واز له شتێك بهێنێت خوای په‌روه‌ردگار له‌و شته باشتری پێده‌به‌خشێت ، وه ته‌نها دوارۆژیش شوێنی پاداشت و هه‌وڵه‌كانمانه با هه‌رچه‌ند ئاواته‌كانمان دوربێت ، جا نازانم چیت ده‌وێت له پۆشینی ئه‌م عابا ڕازاوه‌یه كه به سه‌ده‌ها ده‌یكڕیت ؟! له كاتێكدا كه ده‌خرێیته ناو گۆڕه‌كه‌ت هه‌رزانبایی ترین پارچه‌ت پێوه ده‌پێچرێت !! ئایا ئه‌م عابایه سوودت پێده‌گه‌یه‌نێت له تاریكی قه‌بره‌كه‌تدا ؟!! جا بیر له خۆت بكه‌وه كه ده‌چیته ئه‌و شوێنه .

---

اشتهارهِ علـــى ألسنة كثير من الدعاة والـــخطباء وغيرهم فلـــم أقف عليهِ فـــي الـــمصادر التـــي بحثتُ فيها عنه رغم أنَّ الشيخ الألبانـــي رحمه الله قد ذكرهُ فـــي كتابه الفريد : "جلباب الـــمرأة الـــمسلمة" ص : (47) وقال : رواه أحـــمد بسندٍ صحيح ، والله أعلم .

## خوشكی بەڕێزم

# چی ڕێگریت دەكات لە باڵاپۆشی؟!

وەرگێڕانی

ماموستا فەرەیدون محمد

# چە پکە گوڵێك لە باخچەكانی ئامۆژگاری بۆ خوشكان

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده والصلاة والسلام على عبده ورسوله نبينا محمد واله وصحبه .

بێگومان شەریعەتی ئیسلام شەریعەتی هەمە لایەنەیەو هەموو بوارەكانی ژیان دەگرێتەوەو هیچ لایەنێكی فەرامۆش نەكردووە و هەر لە بچوكترین شت تاوەك گەورەترین شت كە بگونجێت بۆ هەموو كات و شوێن وچینەكانی كۆمەڵگە بە نێرو مێیەوە، یەكێك لەو باسانەی كە خوای گەورە زۆر گرنگی پێ داوە بریتیەیە لە مافەكانی ئافرەت هەر لە ژیان ومیراتیو شوكردن وخووڕەوشت وپۆشینی جلو بەرگ ودایكایەتی و ... هتد .

جا لێرەوە ئەوەی مەبەستمانە لەم پەیامەوە بیگەیەنین بەهەموو موسڵمانێكی حەق وویست ئەوەیە كە بە ڕاستی خوای گەورە زۆر گرنگی داوە بە پۆشاكی ئافرەتی موسوڵمان وجەختیش لەسەر ئەوە دەكات كە پێویستە ئافرەتی موسڵمان هەموو لاشەی دابپۆشێت، چونكە خوای گەورە خۆی كە دروست كەری مرۆڤەكانە دەزانێت كە لەشی ئافرەت چەند كاریگەری هەیە لەسەر پیاو، هەر بۆیە لەم ڕووەوەیە كە دوژمنانی ئیسلام هەستیان بەم خاڵە كردووەو یەكێك لەو چەكانەی كەبەكاریان هێناوە لە دژی موسڵمان بریتیەیە لە

بانگەشەکردنی ڕووتیو سفووری ئافرەت، کەواتە خوشکی بەڕێزم باڵاپۆشی چقڵی چاووی دوژمنانی ئیسلام وموسڵمانەو هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ پاراستی کۆمەڵگە لە بەدڕەوشتیو خراپەکاریو ئابڕوو چوون، چونکە بە ڕاستی ئێوە بناغەی کۆمەڵگەن وکۆمەڵگەیش بە ئێوەوە بەندە جا ئەگەر بەڕێزت پەیوەست بووی بە حیجاب وپۆشاکی شەرعی ئەوا خۆت لە تووڕەیی خوای گەورە دەپارێزیت، وە ئەگەر بە پێچەوانەوە بوویت ئەوا یەکێکی لەوانەی کە بەر توڕەیی خوای گەورە دەکەویت پەنا بە خوا، بۆیە ئەوەی لەم بابەتەدا دەیخوێنیتەوە کۆمەڵێك پرسیارن ئاراستەی چەند خوشکێك کراوە سەبارەت بەوەی : ( ڕێگرەکانی بەردەم باڵا پۆشیت چین ؟ ) .

جابۆیە خوای گەورە باڵا پۆشی لەسەر ئافرەتان فەرز کردووەو تۆیش ئەگەر دەتەوێت شوێنکەوتەی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا( ﷺ ) بیت ئەوا دەبێت جلو پۆشاکەکەت بە وێنەی جلو پۆشاکەکەی ئەوان بێت، هەروەها هۆی حیجاب نەکردنی ئافرەتان دەگەڕێتەوە بۆ چەند عوزرو بیانوویەك کە ئەمەش لە ئەنجامی ئەو پرسیارەی ئاراستەی چەند ئافرەتێك کراوە دەرکەوت چەند بیانوویەکیان هەبوو زۆر لاوازو وەرنەگیراو، کەواتە خوشکی بەرێزم لەوانەیە بیانووەکانی تۆش یەکێك بێت لەم بیانووانە:

پ/ ئەو هۆكارانە چین كە ناهێڵن ببیت بە ( حجاب ) باڵا پۆش ؟

**بیانووی یەكەم** : یەكێك لەو ئافرەتانە ووتی : من هێشتا قەناعەتم بە حجاب نىيە !!!

ئێمەش دوو پرسیار لەو خوشكە دەكەین :

1 ـ ئایا تۆ لە بنەڕەتدا قەناعەتت بە ئیسلام هەیەو باوەڕی پێ دەكەیت؟ بێگومان لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵێ، (أشهد أن لا إله إلا أللّٰه وأشهد أن محمداً رسول اللّٰه) كە ئەمەش قەناعەتە بەدینی ئیسلام وبەمەش حسابی موسڵمانت بۆ دەكرێت، واتە: یاساكانی ئیسلامت بە دڵنیایىيەوە وەرگرتووەو بە بەرنامەی ژیانی خۆشتی دەزانی.

2 ـ ئەی ئایا باڵا پۆش لە ئیسلامدا فەرز نىيە؟ لێرەشدا ئەگەر خۆی وێڵ نەكات ولە تەواوی ڕاستىيەكان پشت هەڵنەكات دەڵێت: بەڵێ .

دەی كەواتە ئەو خوایەی كە تۆ باوەڕت پێی هێناوەو بە خوای خۆتی دەزانی وئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) كە دانی پێدا دەنێیت وبە ڕاستی دەزانیت هەر ئەویش فەرمانت پێ دەكات بە باڵا پۆشی، جا لێرەوە ئایا دەبێت باوەڕت بە خواو پێغەمبەرەكەی( ﷺ ) وبەرنامەكەی هەبێت، بەڵام فەرمانەكانیشی پشت گوێ بخەیت وكاری پێ نەكەیت لە كاتێكدا ئەگەر پێچەوانەی قسەكەی خۆت بیت ئەوا ئەم

فه‌رمووده‌یه‌ی خوای گه‌وره ناتگرێته‌وه كه ده‌فه‌رمێت : ﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (النور : 51) .

واته : گوفتاری باوه‌ڕداران كاتێك بانگ ده‌كرێت بۆ لای خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی(ﷺ) تا فه‌رمانڕه‌وای بكات له نێوانیاندا ته‌نها ئه‌وه‌یه كه ده‌ڵێن: بیستمان و گوێڕایه‌ڵین بۆ هه‌موو فه‌رمانێكی شه‌رع، وه هه‌ر ئه‌وانه‌شن كه سه‌رفرازوو سه‌ركه‌وتوون .

**بیانووی دووه‌م :** ئافره‌تێكی تر ووتی : له وڵاته‌كه‌م ئاوو هه‌وا گه‌رمه‌و ناتوانم حیجاب بكه‌م ؟

ئێمه‌ش له وه‌ڵامدا به‌و ئافره‌ته‌و نمونه‌ی ئه‌و ئافره‌ته ده‌ڵێین : خوشكی به‌ڕێز ئایا گه‌رمای دونیاو گه‌رمای تیشكی خۆر گه‌رمتره یان گه‌رماو هه‌ڵاوی ئاگری دۆزه‌خ؟ وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رمێت : ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ (التوبة: 81) .

واته : ئه‌ی محمد(ﷺ) پێیان بڵێ ئاگری دۆزه‌خ زۆر گه‌رمتره ئه‌گه‌ر تێبگه‌ن وبیرو هۆشیان بخه‌نه كار .

كه‌واته چۆن گه‌رمی ووڵاته‌كه‌ت وه‌ك ئاگری دۆزه‌خه ؟ !

بۆیه بزانه ئه‌وه ته‌نها شه‌یتان تۆی له خشته بردووه‌و هه‌ڵی خه‌ڵه‌تاندووی وكه‌وتویته‌ته داوی‌یه‌وه‌و به بیانووی ئه‌وه‌ی له گه‌رمای

لاوازی دونیاوه بتگوێزێته‌وه بۆ گه‌رمای به‌تین و بڵێسه‌داری دۆزه‌خ ، وه بزانه خوشكی به‌ڕێز ژیانی دونیا ته‌نها گه‌رمای هاوین و ساردی زستان نی‌یه ، به‌ڵكو ئه‌ی چی ده‌ڵێی بۆ وه‌رزه‌كانی تر ؟! بۆیه پێویسته خۆشی دونیاو ڕازاوه‌كه‌ی بكه‌یته قوربانی ڕزگار بوون له گه‌رمای دۆزه‌خ .

خوای گه‌وره‌یش ده‌فه‌رمێت : ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا﴾ (النبأ: 24ــ25).

واته : له دۆزه‌خدا هیچ فێنكی وخواردنێك ناچێژن جگه له ئاوی كوڵاو وكێم وزوخاو.

**بیانووی سێیه‌م:** یه‌كێكی تر له‌و ئافره‌تانه له‌وه‌ڵامی ئه‌و پرسیاره‌دا ووتی: من قه‌ناعه‌تم به واجب بوونی حیجاب هه‌یه به‌ڵام دایكم ڕێگریم لێ ده‌كات، وه‌ئه‌گه‌ر بێ فه‌رمانی دایكیشم بكه‌م ئه‌وا دۆزه‌خ جێگه‌مه .

بۆ وه‌ڵامی ئه‌م خوشكه‌ش ده‌ڵێین: به‌ڕێزه‌كه‌م ئاگادارو وشیار به ڕاسته دایك وباوكت ڕێزی خۆیان هه‌یه‌و به تایبه‌تیش دایك، به‌ڵام له كاتێكدا ئه‌وان هانت بده‌ن بۆ سه‌رپێچی خوا ئه‌وا له‌و كاته‌دا به گوێ

كردنیان دروست نیيەو ڕێی پێ نەدراوە چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمێت : ( لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)[1] .

واتە : گوێڕایەڵی هیچ دروست كراوێكی خوا ناكرێت لە شتێكدا كە یاخی بوونی خوای تێدا بێت .

بەڵێ ڕاستە خوای گەورە ڕێزی دایك و باوكی گرتووەو دەفەرمێت : ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ (النساء: 36).

واتە: ئەی خەڵكینە تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە هاوەڵێكی بۆ پەیدا مەكەن و چاكەكار بن لەگەڵ دایك وباوكتاندا، بەڵام لە كاتێكدا داوای سەرپێچی خوایان لێ كردی ئەوا : ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾ (لقمان: 15).

واتە: ئەگەر دایك وباوكت كۆششیان لەگەڵت كرد تا بە بێ هیچ بەڵگەیەك و زانیارییەك هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدەیت ئەوا بە هیچ جۆرێك فەرمان بەرداریان مەبە وبەقسەشیان مەكە.

دەی كەواتە چۆن گوێڕایەڵی دایكت دروستە بۆ پشت گوێ خستنی فەرمانی خوایەك كە خۆت ودایكیشتی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون؟! لە كاتێكدا خوا بانگت دەكات بۆ بەهەشت و دایكیشت

(1) (صحيح الجامع الصغير، رقم: 7520).

doورت دەخاتەوە لە بەهەشت ، کەواتە فەرمانی کامیان جێبەجێ دەکەیت ؟

**بیانووی چوارەم :** خوشکێکی تر بیانووی ئەوە بوو کە دەستیان ناڕوات تا پۆشاکێکی شەرعی لەبەر بکات .

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش : ئەم خوشکە لە دوو حاڵەت بەدەر نی‌یە .

یەکەم : یان ڕاستگۆو دڵسۆزە .

دووەم : یان ڕاست ناکات و حیجابێکی گران بەهاو بە مۆدێل وڕازاوەی دەوێ، جارێ لە خوشکی ڕاستگۆوە دەست پێ دەکەیت .

بەڵێ لە کاتێکدا تۆ دەزانی دروست نی‌یە بۆ ئافرەتی موسڵمان بە جلو پۆشاکی ناشەرعی‌یەوە بچێتە دەرەوەی ماڵ کە مەرجەکانی شەرعی‌یەتی تێدا نەبوو کە ئەویش پێویستە لەسەر هەموو ئافرەتێکی موسڵمان ئەوە بزانێت، ئەگەر نا ئەوا با پرسیار لە کەسێکی شارەزا بکات: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (النحل: 43).

واتە : پرسیار بکە لە کەسانی زیرەك و خاوەن زانیاری لە کاتێکدا کە خۆت نایزانی .

بۆیە لێرەوە پێویستە خۆت یەکلا بکەیتەوەو لە شوێنکەوتنی شەیتانی سەرشۆڕ خۆت ڕزگار بکەو ئەوجا هەزاران خوشکی موسڵمان

و برایانی دیندار هەن كە دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەكەن‌و خوای گەورەیش دەفەرمێت : ﴿ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾ (الطلاق: 2-3).

واتە : جا ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزگار بێت ئەوا خوای گەورە دەروی لێ دەكاتەوە، وە بە شێوەیەك رزق و رۆزی بۆ دەنێرێت كە حسابی بۆ نەكردبێت و خۆی پەی پێ نەبردبێت.

هەروەها بۆ دووەم كە ئەمەیان بە دوای مۆدێل‌و جوانیدا دەگەڕێت كە ئەمەش لە دینی خوای گەورەدا زەم كراوە، چونكە خوای گەورە دەفەرمێت : ﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ (النور: 31).

واتە : با جوانی لەش ولاری خۆیان دەرنەخەن بەوەی كە حیجاب دەپۆشن، چونكە حیكمەتی حیجاب ئەوەیە كە جوانی ئافرەت بشارێتەوەو سەرەنجی پیاوی پێ ڕانەكێشێ، بەڵام ئەگەر خۆی ڕازاندەوەو جوانی خۆی دەرخست ئەوا پێی ناوترێت باڵا پۆش، وە ئەوەی خوا لەسەری فەرز كردووە جێ بەجێی نەكردووە. هەروەها بەڕاستی هەڵەیە ئەگەر وابزانرێت كە ڕێزو پلەو پایە بە خۆڕازاندنەوەو شتی جوانەوەیە لە كاتێكدا چاوڵێ كەری سەردەم پلەی هیچ كەسی بەرز نەكردۆتەوە، بەڵكو پلەی بەرزی تۆبە: ﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾ (الحجرات: 13) .

واته : بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە کە زیاتر لە خوا دەترسێت و فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکات.

هەر بۆیە پرسیار کرا لە شێخی پایەبەرز (محمد بن صالح العثيمين) دەربارەی حیجاب و جوانکاری تێیدا؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (ڕازاندنەوەی جلو بەرگی شەرعی بۆ ئافرەتان بە نەخشو جوانکاری دروست نیە، چونکە خوای گەورە دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کە پیر بوون و بەتەمای شوکردنیش نەماون چ جای ئافرەتێکی گەنج دەفەرمێت: ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ﴾ (النور: 60).

واتە: ئەو ئافرەتانەی کە پیر بوون و بەتەمای شوکردن نەماون ئەوا هیچیان لەسەر نیە ئەگەر روویان دەربخەن بە مەرجێك لەنج ولاری نەنوێنن لە ڕۆیشتندا، وە جوانی بە ئەنقەست دەرنەخەن)[1].

**بیانوی پێنجەم :** ئافرەتێکی تر ووتی: ئەگەر ببم بە باڵا پۆش دەترسم لە دواڕۆژدا وازی لێ بهێنم کە زۆر ئافرەتی وام بینیوەو وازیان هێناوەو بوونە بە سفور .

لە وەڵامدا دەڵێین : باشە ئەگەر هەموو کەس وەکو تۆ بیری بکردایەتەوە ئەوا وازی لە هەموو دین دەهێناو تەنانەت نوێژو

[1] (توجيهات وفتاوى مهمة لنساء الأمة: ص7).

ڕۆژوویشی وازی لێ دەهێناو ئەنجامی نادا، چونکە ئەترسا لەوەی ڕۆژێك وازی لێ بهێنێ ... بەڵام بەڕێزەکەم زۆر هەڵەی بزانە چۆن کەوتویتە داوی شەیتانەوەو ڕاستیەکانی لێ وون کردووی، لە کاتێکدا خوای گەورە زۆر شارەزا ترە لەوەی کە لە دڵی تۆدا هەیەو هیدایەتی تۆش تەنها بە دەستی خوایە، هەروەها بەردەوامی و دامەزراوی لەسەر کردارەکان خۆشەویسترین شتن بە لای خواوە وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمێت : " أحب الأعمال إلى الله أدومه وإن قل " .

واتە : خۆشەویسترین کردەوە لای خوای گەورە ئەوەیە بەردەوام بیت لەسەری با کەمیش بێت .

باشە ئەی بۆچی لەو هۆکارانە ناترسیو لێیان دوور ناکەویتەوە کە ئەو کەسانەی بەرەو داماڵینی حیجاب برد تاکو تۆش وات لێ نەیات، کە من پێم وایە پێچەوانەکەی بەکار بهێنیو بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێی کە دامەزراویو بەردەوامیت پێ دەبەخشێت لەسەر دینی خوا لەوانەش: (قورئان خوێندن و لێ وورد بوونەوەی، زۆر دوعا کردن، زیاد یاد کردنەوەی مردن، هاوڕێیەتی ئافرەتی چاك، وەرگرتنی ئامۆژگاری لە کەسی چاك ... ) .

وەك خوای گەورە دەفەرمێت : ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ (النساء: 66).

واته : ئه‌گه‌ر ئه‌وانه به ڕاستی به گوێره‌ی ئامۆژگاری‌و فه‌رمانی ئێمه ڕه‌فتاریان بكردایه ئه‌وا چاكتر بوو بۆیان‌و دامه‌زراوتر‌و چه‌سپاوتر ده‌بوون له‌سه‌ر حه‌ق‌و ڕاستی .

**بیانووی شه‌شه‌م :** یه‌كێكی تر له‌و ئافره‌تانه ووتی : پێم ده‌ڵێن ئه‌گه‌ر بێت و حیجاب له‌به‌ر بكه‌یت و ببیته باڵا پۆش ئه‌وا كه‌س تۆی ناوێت و هه‌رگیز شوو ناكه‌یت بۆیه منیش تا شوو نه‌كه‌م حیجاب ناكه‌م .

له‌وه‌ڵامی ئه‌م خوشكه‌شدا ده‌ڵێین: له ڕاستیدا ئه‌و پیاوه‌ی كه تۆی ده‌وێت به مه‌رجی رووتی وسفوری ئه‌وا له خوا یاخی بووه‌و یه‌كێكه له به‌چكه‌كانی شه‌یتان، بۆیه تۆش زۆر له‌وه گه‌وره‌تری كه شوو بكه‌یته یه‌كێك له بێچوه‌كانی شه‌یتان، چونكه ئه‌و پیاوه شه‌ره‌فی تۆی پێ ناپارێزرێت وبیریش له پاشه‌ڕۆژی تۆ ناكاته‌وه، بۆیه زانیاری به‌ڕێزیشته بنیات نانی خێزانێك له‌سه‌ر به‌خته‌وه‌ری و كامه‌رانی وخۆش گوزه‌رانی ئافره‌ت و پیاوه، كه ئه‌م به‌خته‌وه‌رییه‌ش ته‌نها له ئیسلامدا هه‌یه‌و لای ئه‌و جۆره پیاوانه ده‌ست ناكه‌وێت، به‌وه‌ش كه حه‌وانه‌وه‌و جێ نشینگه‌ی ئه‌و خێزانه‌ش به یادی خواوه‌یه، خوای گه‌وره‌ش ده‌فه‌رمێت: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (طه: 124).

واتە : ئەو کەسەی کە ڕوو وەڕبگێڕێت لە یادو بەرنامەی خوا وپشتی تێ بکات بێگومان بۆ ئەو کەسانە ژیانێکی تەنگ و تاڵیان بۆ هەیەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشر دەکرێن .

جا بۆیە لە ڕاستیدا پێکەوەنانی ژیانی هاوسەری نیعمەتێکی خوایی‌یەو خوای گەورەیش بیەوێت دەیدات بە هەرکەسێك کە خۆی ویستی لێ بێت، کە ئاشکراشە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا چەندان ئافرەتی سفور گەڕاونەتەوە باوەش ئیسلامە پاکەکەی خواو بۆیان دەرکەوتووە کە بەختەوەری تەنها لە ژێر چەتری ئەمدایە، وە ئەگەر دەیشلێێت هەموو هیواو ئاواتم شوو کردنە بە ڕووتی‌و سفوری بەمەرجی دەگریت ئەوا بێگومان ئاواتی پاك وبێ گەرد بە هۆکاری پیس وچەپەڵ نایەتە دی، کەواتە چەندان ئافرەتی سفورو ڕووتیشمان بینی پرچی سپیان هۆنی‌یەوە .

**بیانووی حەوتەم :** ئافرەتێکی تر ووتی: بۆیە حیجاب ناپۆشم دەمەوێت ئەم ئایەتەی خوا جێ بەجێ بکەم کە دەفەرمێت : ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾ (الضحی: 11). واتە : باسی ئەو بەخشش ونیعمەتانە بکە کە خوای گەورە پێی بەخشیوی .

خوای گەورەیش قژێکی ناسك ولەش و لارێکی جوانی پێ دوام چۆن لە خەڵکی بشارمەوە؟

له وەڵامی ئەم ئافرەتەشدا دەڵێین : ئەم خوشكه وا خۆی نیشان دەدا كه خەمخۆری ئیسلامه وپابەندی قورئان و فەرمووده بەڕێزەكانی پێغەمبەری خوایه(ﷺ) كه ئەو ئایەته دەكاته بەڵگه.

ئەی باشه بۆ نایات ئەم ئایەتەش بخوێنێتەوەو له خۆیدا جێ بەجێی بكات كه خوای گەوره دەفەرمێت : ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ (النور: 31).

واته: با جوانی ولەش ولاری خۆیان بەدەرنەخەن تەنها ئەوەنده نەبێت كه شەرع بۆیانی داناوه.

یان له ئایەتێكی تردا دەفەرمێت : ﴿ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ﴾ (الأحزاب: 59) ، واته:با پۆشاكی ئافرەتان هاودامان بێت و هەموو لاشەیان دابپۆشێت .

كەواته ئەم قسەیه هەڵبەستراو ویاسایەكی ئارەزووی خۆیەتی، بەڵام به پێچەوانەوه نیعمەتی خوا بۆ تۆ باڵا پۆشیه نەك ڕووتیو سفوری ، كەواته تۆ نیعمەتی خوا كه حیجابه دەیشاریتەوه چونكه بریتی - یه له ڕەوشت وپۆشاكی خێزانەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)كه گەورەترین و بەڕێزترین دیاری خوایه بۆ تۆو هەموو ئافرەتێك، وه هۆكارێكی بەرزیشه بۆ سەربەرزی تۆو هەموو ئافرەتان له دونیاو له دواڕۆژدا .

**بیانووی هەشتەم:** ئافرەتێكی تر ووتی: من لاریم لەوە نیەیە كە باڵا پۆشی واجبێكی خوای گەورەیە بەڵام كاتێك حیجاب دەپۆشم كە خوای گەورە هیدایەتم بدات.

بۆ وەڵامی ئەم ئافرەتەش دەڵێین: ئایا ئەگەر لێت بپرسین ئایا تۆ هیچ هەنگاوێكت ناوە بۆ هیدایەت دانت؟ چونكە دەبێت ئەوە بزانیت خوای گەورە بۆ هەموو شتێك هۆكارێكی داناوە وەك چۆن كەسێك كاتێك نەخۆش دەكەوێت پێویستە سەردانی پزیشك بكات بۆ ئەوەی دەرمانی بۆ دابنێت وبیخوات تا خوا شیفای بۆ دەنێرێت، یان كەسێك بیەوێت سەفەر بكات پێویستە هۆكاری سەیارە یان تەیارە بەكاربهێنێت، دەی خوشكی بەڕێز ئایا تۆ هیچ هۆكارێكت بەكارهێناوە تا خوای گەورە هیدایەتت بدات؟ هەروەك چۆن فەرزی كردووە لەسەرت ڕوو بكەیتە قیبلە و ڕۆژانە لە نوێژەكانتدا 17 جار بڵێی : ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ (الفاتحة: 6) ، واتە: خوایە ڕێنمونیم بكە بۆسەر ڕێگا ڕاستەكەی خۆت.

یان ئایا بەشداری هیچ كۆڕو كۆبونەوەیەكی خوشكانی موسڵمانت كردووە یان بەشداری دەرس ودەورەكانی ئافرەتان و وانەی دینیت كردووە؟ ئەگەر نا ئیتر چۆن خوای گەورە هیدایەتت بدات؟! ئەی نازانی ڕۆژێك دێت وتەوبە وەرناگیرێت و تۆش نازانیت ئەو ڕۆژە كەیە

دەی ئیتر بۆ فەرمانی خوا دوا دەخەی : ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ﴾ (یونس: 32) ، واتە : چی هەیە لە دوای ئەم ڕاستیەوە جگە لە گومڕایی .

**بیانووی نۆیەم:** یەکێکی تر لەو ئافرەتانە ووتی: من ئێستاکە بچوکم کاتی پۆشینی حیجابم نەهاتووە واتە هێشتا گەنجم و بەبەرمەوە ماوە هەرکات گەورە بووم ئەوسا دەیپۆشم.

بەڕاستی ئەمەش بیانوویەکی خۆهەڵخەڵەتێنەرەو یەکێکە لە هۆکارەکانی لە خشتە بردنی مرۆڤەکان لە لایەن شەیتانی جن ومرۆڤەوە، چونکە ئەی خوشکی بێ ئاگا ئەی نازانی (ملك الموت) ئامادەیەو هەرکات فەرمانی پێ بکرێت ئاگادارت ناکاتەوەو هیچ مەجالت نادات؟ وە ئایا هیچ کەس پەیمانی ئەوەی پێ داوی کە تۆ بەم زووانە نامریت و تەمەنت درێژ دەبێت؟! ئەی نازانی خوای گەورە دەفەرمێت : ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾ (الأعراف: 34).

واتە: هەرکاتێك کۆتایی بە تەمەنیان هات نە تاوێك دوادەکەون نە تاوێك پێش دەکەون چونکە ئەجەلیان دیاری کراوە. بەڵێ بە ڕاستی مردن واتە: دابڕانی ڕوح لە لاشە پچڕاندنی پەیوەندی مرۆڤ و دونیا بێ گومان دەبێت هەموو کەس ئەو سەفەرە ئەنجام بدات بچوك بێت

یان گەورە، دەوڵەمەند بێت یان هەژار، دەسەڵاتدار بێت یان بێ دەسەڵات، ئەی خوشكی بەڕێز: بەڕاستی سەفەرەكە دوورودرێژە تۆش گەشتیاری لەم دونیایەدا، ئەی هەژاری بێ توێشوو دەی بیهێنە بەرچاوی خۆت ئەوا (ملك الموت) گەیشتە سەرت ولە پشت سەرت دەوەستێت بۆ گیان كێشانت لەو كاتەدا سنگت دەتەقێو ڕوحت دەكەوێتە غەرغەرە، زمان لە دەمتا ناگەڕێت قسە قورس دەبێت بەلاتەوە، چاوەكانت دەچنە پشتی سەرت ودەرگای تەوبەیش دادەخرێت، كەواتە زوو پەشیمان ببەوە تاوەكو دەرگای تەوبەت لێ دانەخراوە، چونكە تۆ بە چەكی ڕووتیو سفوری جەنگت لەگەڵ خوادا بەرپا كردووە، بۆیە درەنگەو بگە بەكاروانی ئەو خوشكانەی كە پێش تۆ كەوتوون، خوای گەورەش دەفەرمێت: ﴿سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ (الحديد: 21).

واتە : پێشبڕكێ بكەن بۆ لێخۆشبوونی خوایی و بەهەشتێك كە پانایی‌یەكەی وەك پانایی ئاسمان و زەوی‌یە.

**بیانووی دەیەم:** كۆتا خوشك لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا ووتی: ئەترسم لەوەی كە ئەگەر پابەندی حیجابی شەرعی ببم بمكەنە پاڵ حزب و كۆمەڵێك و منیش ڕقم لە حیزبایەتی‌یە.

**لە وەڵامدا دەڵێین :** خوشکی بەڕێز واز لەو بۆچونە بهێنەو ئەو خەیاڵەش لە مێشکی خۆت دەربکە، چونکە کاتێك خوای گەورە فەرمانی کردووە بە حیجاب کردووە ئەوا نەك ناوی حیزب ئەوا هیچ جیاوازییەك نەبووە لە دەربڕینی ئەو بۆچونەدا ، بۆیە لە ڕاستیدا لە قورئانی پیرۆزدا تەنها دووکۆمەڵ هەن کە خوای گەورە باسی کردوون وناویانی بردووە ئەوانیش ( کۆمەڵی شەیتان ) و( کۆمەڵی خوا ) وەك خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴾ (المجادلة: 19).

واتە : ئاگادارین بێگومان دەستەو تاقمی شەیتان لە خەسارەت مەندی و زەرەر مەندیدان .

کۆمەڵی یەکەم : واتە کۆمەڵی شەیتان : ئەو کۆمەڵەی کە دار و دەستەکانی بەردەوام خەریکی بێ ئەمری خوان هەمیشەش لە بڵاوکردنەوەی خراپە و دووبەرەکی و تۆوی بەرەڵایدا دەستێکی باڵایان هەیە.

هەروەها کۆمەڵی دووەم: بریتین لە کۆمەڵی خوا کە ئەوانەن خوای گەورەو میهرەبان پشتیوانیانەو هەمیشە یارمەتیان دەدات بۆ هەموو کارێکی چاکەو خۆشیان ملکەچی فەرمانەکانی خوان وخۆیان بە دوور دەگرن لە سەرپێچی وشتی داهێنراوو دوور لە ئیسلام.

كەواتە: ئەگەر بەڕێزت یەكێكی لەو كەسانەی حیجاب دەپۆشیت و خۆت بە دوور دەگریت لە بێ فەرمانی خواو هەمیشە خەریكی كاری چاكەی ئەوا ( یەكێكی لە كۆمەڵی خوا ) بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر سفورو ڕووت بیت و لەش ولاری خۆت بۆ خەڵكی بێگانە دەر بخەیت ئەوا یەكێكی لە هاوباوەڕانی شەیتان و ئەندامێكی چالاكیشی لەو كۆمەڵەیەدا .

خوشكی بەڕێزم ... دڵنیابە باڵاپۆشی فەرمانی خوایەو پەیوەندی نىیە بە هیچ شتێكەوە بۆیە نابێت لەبەر لۆمەی لۆمەكاران وخراپەی بێ باوەڕان پشت بكەیتە فەرمانی خواو بەرەو لای شەیتان ڕابكەیت خوای گەورەیش دەفەرمێت : ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ ( الذاريات : 50 ) .

واتە : بەپەلەو گورج وگۆڵ بن بۆ بەجێهێنانی فەرمانەكانی خوا ، دڵنیاش بن من (محمد) (ﷺ) ترسێنەری ئاشكرام بۆتان .

كەواتە نوێژو ڕۆژوو بۆ كێ ئەنجام دەدەیت ؟ ئەی بۆچی ئەنجامی دەدەیت ؟ وەڵام : چونكە نوێژو ڕۆژوو بۆ خوا ئەنجام دەدەم ، لەبەر ئەوەی فەرزی كردووە لەسەرم ، دەی كەواتە ئەو خوایەی نوێژوو ڕۆژووی لەسەرت فەرز كردووە هەر ئەو خوایەشە حیجابی لەسەرت فەرز كردووە .

## بۆنی گوڵێك له كۆتاییدا:

ئەی خوشكی بەڕێزم..... ئەی ئەو كەسەی خوای گەورە ڕێزی لێ ناوی بۆچی خۆت بێ ڕێز كردووەو له بازاڕی شەیتاندا نمایش دەكەیت؟! ئایا دەزانیت بەهەر خۆ جوان كردنو ڕازاندنەوەیەك دڵی هەر گەنجێك بۆ لای خۆت ڕادەكێشیتو بێگومانیش دەبیتە هەڵگری كۆڵی تاوانی چەندان كەسی تر، وە بیشزانه تۆ هەر ڕۆژێك له تەمەنت دەڕوات بەرەو گۆڕی خۆت نزیك دەبیتەوە، وەهەر كاتێك له تەمەنت دەڕوات بەرەو نەمان دەچیتو سەرەنجامی خۆت دیاری دەكەیت.

سبحانك اللهم وبحمدك

أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك.